محمد توفیق وردی

# هێندێ لە هەلبەست و بەیتەکانی

## عەلی بەردەشانی



وەزارەتی کارو باری سەروو ـ بەریوە بەرایەتی گشتی خویندنی کوردی بو
چاپ کردنی ئەو کتیبە یارمەتی داوم .

# هەندی

## لەبەیتو هەلبەستەکانی
## عەلی بەردەشانی

### کوکەرەوەی
### محمد توفیق وردي

وەزارەتی کارو باری سەروو بەریوەبەرایەتی زانیاری
خویندنی کوردی لە چاپ کردنی ئەو کتیبە یاریدەی داوم

چاپ خانەی القضاء — نەجەف — ١٩٧٢

# سوپاس

سوپاسێکی زور بێ‌پایان بو ئەو دوست و برایانەی خوارەوەکە بەهەموو هێزیانەوە یاریدەیان دام بو کوکردنەوەی ئەو گەنجینە کە لەبەردەستی خوێندەوارانە

(١) کاك حمید عزیز ـ خەلکی قەلادزەو لەدەرچووی بەشی فەلسفە لەدانش گای بەغدا . . .

(٢) کاك رفیق صابر ـ قوتابی بەشی کوردي لەدانش گای بەغدا .

(٣) احمد بکر ئاکوي : مدیری غاباتی کونی هەولیرو بازنو شستەیە ئیستی .

(٤) کەمال میراو دەلي : دەرچوی بەشی ئینگلیزی لەدانش گای بەغداو ماموستایە لەقەلادزە .

« » « » « »

ئەو دوست‌و برایانە هەول دانیان هەرگیز لەبیر ناچیتەوە هیوام وایە هەر لەژیانیان سەرکەوتروبن . . . نابێ‌ئەوەشم لەبیر بچێ کە ماموستای بویژ « روستەم فەتاح » ی گوێیش چەند بەیتیکی بو ناردم سوپاسیکی بێ‌پایانیش بو ئەو . . .

# سەرگوزەشتی
# عەلی بەردە شانی (١)

زور بەداخەوە روژی لە دایـــك بوونو مردني نازانين
بەلام بەتەخمين بومـان دەردەكەوێ كە لەسەدەی هەژدەمین
ژیاوە . لەکاتێ کە دەولەتي ( بابان ) لە هەرە پلەی گەشەدار
دابوو تەمەني خوی بردوتە سەر . بە بەرردەشاني ناوی دەرکرد
کە گوندێکە دەکەوێتە ناحیەی ( مەرگە ) سەر بە قەزای قەلادز
لە وولکەی سلیماني . بەلام کاتي لەدایك بووني لە دێي (اوناو
بوە . .

هەندی کەس دەلین هەر لە مندالیەوە کوێر بوە(٢) بەلا

---

(١) لەسالی ١٦٧٠ ئیمارەتی بابـان دورسـت بووەو لە سا
١٧٨٨ دا عبد الرحمن پاشـا حوکم ران بوە یەنی لەپێش ئ
سال دا عەلي بەردەشانی ژیاوە بەلامبەداخەوە نازنین چەنە سا
ژیاوەو چون مردوەو گوری لەکوی‌یە ئەوە شتێکە نەزانداراو
عبد الله پاشاش لە سالی ١٨٤٧ دا ژیاوە . وە لە سالی١٨٥١ داك
ئیمارەتە بەدەستی عوصمانیەکان لەناو چوە یەنی لەکاتی دامەزرا
هەتا لەناوچوونی نزیکەی ٣٠٠ ـال بەردەوام بوە . .

(٢) پەرەژنیکي شابەردەلێت :

عەلیە کوێرەی بەردەشاني
توری توری ناني نـاني

بەلای منەوە ئەوە راست نیە ، چونکە لە هەلبەستەکانی دا ئەوە دەرناکەویت ، دوور نیە لەدوا پلەی ژیانی دا کوێر بووبێت وەکوو لە هەلبەستی شای ( چندووکان ) دەردەکەویت .

ئەخوێنەدەواریشی زور باش لامان ساغ نەبوتەوە ، هەندی کەس دەلێن فەقی بوەو خوێندن و نووسین زانیوە بویەش بیرو باوەری ئاینی زور کاری تێکردوە ، سەرەتای هەموو بەیتەکانی بەناوی خواوو پیغەمبەر دەست پێ دەکات .

یەك جار گەریدە بوە ، هەتا لەگەل ( ئاورەحمان پاشای بەبە ) چوتە ئاران ( فولکلوری کوردی بەشی دووەم ) بخوێنەوە هەلبەستەکانی مێژوو جوغرافیەی ناوچەکانە کە پیا رویشتوە کەلێ ناوی دێ هەیە نازانین ماون یان نە . . .

دەلێن میری سوران ( سلیمان بەگی هەریری ) ( ۱ ) بویژێکی دەبێت بەناوی ( عەلی حەریر ) ی بێ گومان ئەو علی حەریری یە ئەو شاعیرە نیە کە بەشێوەی کرمانجی هەلبەستی داناوە یەکی ترە ) نامە بو عەلی بەردەشانی دەنیرێت کە بێتە هەریر وە لەگەل عەلی هەریری بکەونە شەرە هەلبەست کەلەو سەردەمانە داشەرە شیعر باو بوە . .

ئەویش دەچێت بولای میری سوران هەردوو بویژ بەسەر

(۱) بو ئەوە باشتر لەسەرگوزەشتی سولەیمان بەگ ئاگادار بیت نامیلکەی ( خانزادو لەشکری ) بخوێنەوە . . .

خشلي ژنان هەلدەاێن بەلام بەداخەوە هەردوو هەلبەست فەوتاو
تەنیا ئەو چەند دیڕەم لەشیعری عەلي هەربری لە بیر ماوە کە
دەلێت :

لەولای گوارە هەلی دەدای
دەی گوت تا من بووم لەگوێی لەیلای
دەمانە داخوازیم پاشای بەغدای
جێگەم مەحکەم بوو نەهاتمە رای

لەئەنجام هەر یەکیان بەوی تر دەلیت : ( تو مامو ستای
میریش هەریەکەی تفە نگێکو ئەسپێکو شیرو خەنجەریکیان
خەلات دەکا . .

« » « »

( عەلي ) هیچ شتیك نیە کە هەلبەستی بەسەر دا هەل
نەدابێت : ( یار . دێ . کەروکا . ئاژال .
جندوکە . پیاز . شمشیرو چەکی شەر . کیسەل . . و . . . )
لە هەلبەستی هەجووش دا دەستیکی بالای هەبوە .
خو لە هەلبەستی ( حەماسی میللی ـــ شەرو
جەنگ ) کەم کەس وەکوو عەلي توانا بوە ، بەلای منەوە بەیتی
ئاورەحمان پاشای بەبە لە بەرز ترین حەماسەی میللیە چونکە
کورد هان دەدات کە دەبێ نیشتمان پەروەر بن ، شورش

لەدژی جەللادەکانی عوسمانی هەل گیرسێنن وە بەجەنگاوەران دەلێت :

هەرچی هەلێت زولف دارێ

هەندێ جاریش بو پێکەنین خوی بەرامبەر بچووکترین گیان لەبەر کەم دەکاتەوە :

والحاصل کە بوو بە شەر
شەری مەنگورو مامەشان
رەو رەوەیان راکێشان

— ٢ —

رەو رەوەی دەزری داری
ماینە شێنکی قەزوانی
کریومە بە سەد قرانی
کاعەلی پیی نەزانی

— ٣ —

لەو کاعەلیەی سەر بە بنیات
ساحیبی هەژدە وولات
لەبەر کیسەلی هەلات ! (١)

(١) ئەو هەلبەستە کە هەلبەستی کیسەلە ، رەمزی یەو مەبەستێکی قوول تیدایەو رەخنە یە دەیسکرێت لە کومەلی کوردەواری .

دەلێن ( عەلی خەونێکی دیوە لەو خەونە دا دەمی بونە شارە میروالە ، لەمەلایەکی پرسیوە کە تەعبیری ئەو خەونە چیە ؟ مەلاش ووتویە : دەبیتە بویژیکی زور بە ناوو ناوبانگ

لیرە دا ئەوەش پیویستە کە بینووسین :

کە هەلبەستو بەیتەکانی عەلی لەناو لیستەی هەلبەستی میللی فولکلوري دەژمیر دریت گەرچی خوشی ناسراوە . . . چونکە هەلبەستو بەیتە بە نرخەکانی وەکوو ئاوینەی ژیانی راستەقینەی گەلی کوردە لە سەردەمەکانی سەدەی هەژدەمین دا ، ووشەکانی زور پەتیو جوانو ریكو پیکن ، ووشەی بیگانە زور کەم بەکار دەهینێ . . . گەلی هەلبەستی نووسراوە ئەوە لە مەختەروتە یەکی کون دا وا نیستا لەبەرلینی روژ هەلاتە زور هەولم دا کە دەستم بکەویت بەلام سەرنەکەوتم . .

« » « » « »

گرینگی عەلی لەوەیە : لە کاتیك دا بویژەکانی ترمان کەمەلاو خویندەوار بوون بەفارسیو عەرەبی شیعریان داناوە ، یان هەموو هەلبەستەکانیان تەنیا باسی دلداریو یارە ، ئەو بویژە میللیە هەستی نیشتمان پەروەری پالی پیوە ناوە کە بەیتی میللی حەماسی ریك بخات و هانی کورد بدات بو شورشو رزگاری بویە عەلی لەریزی بویژانی ئەمر دەژمیر دریت ) . . . چونکە هەلبەستی نیشتمانی بو دوا روژی کورد یەك جار گرینگە . .

# رویشتنی عەلی بو مەرگە (١)

کاروان لە دێی بەردەشانەوە دەچیت بو ( مەرگە ) بەریك کەوت ( عەلي ) لە گەلیان دەروات ، نزیکی ( مەرگە ) دەبنەوە ،علی لەدولی مەرگە زور تینوو دەبێ لادەدانە لای ئەو کەپرانەی کە ئوونە وانەکان دورستیان کردوون ، بو ئەوە کەمی ئاو بخوانەوە . کاتی دەچیتە ژیر کەپریك دە بینێ کچیکی دل رفین و شەنگ و شوخ لەبن کەپرەکە دانیشتوە ( عەلی ) ش لە جوانی کچە سەر سام دەبیت ، ئەوەی روو دەدات ئەوەیە تومەز کچەش دە ستی بویژی دەبێ وە بە هەلبەستاە ( عەلي ) رادەخـــورێت لە گەل یەکتر دا دەکەونە دەمە تەقە :

هـەتیو ئــەوی لـەوێ
کەر تینووتە ئــاوە لەوێ
کەر برســیتە نانە لەوێ
دەنـــا دزي برو لەوی !

عەلي :

دز نیـــم نـاروم لەوێ

(١) مەرگە - نیسێ ناحیەیەکە لە سەر قەزای قەلادزەی پشدەر بەلام لە کانی خوی دا لە دەوری بابانەکان میر نوشین بوە نیستاش قەلاو جیگاکانی کونی تیدا ماوە . .

تینوو نیــم ئاوم ناوی
برســی نیم نـانم ناوێ
ماچی دوو کولمی تۆم دەوی !

کچ :

هەتیــو بــرو لــەوی
شەش برایە کەم بوت دینەوی
لەت لەت دەکەن بە خەنجەرێ
لەم شارە دەت کــەنە دەری

" " "

کورە هەتیو من کوتری تەقلەبازم
خو بەدەســت راوچی نادەم
هەســتە برو هەتیوەی بی ئەرە
هیچی تــر لیرە مــەوەرە

هەلی :

کچێ من مــاری رەشم
چل گەز لە عەردی روو دەچم
تو کوتری من شــەهینم
سووکو ئاسان دەت فرینم
بالم هەیە بیستو چوار پەر
هەلات دەگرم لەشار دەت بەمە دەر

کچ :

هەتیو چیت لە من داوە
گولیکم‌دەورەم پەرژین کراوە
من قەلایە کم حەفتا سال
خەریکە بم کەنی قەل و دال
بەلام نەیان توانیوە
بەخەویش منیان نەدیوە
فەرموو وەرە پیشەوە
بەبی دەردو ئیشەوە
کاروان کەر هاتن دەچونە خوار شەوە

عەلی :

من خوم پەرژین شکینم
هەلت دەکرم دەت فرینم
پیم ووتی شەهیق بیستی‌و چوار پەرم
سووکو ئاسان بوت دەفرم
دیم تەوقی سەرت دەکرم

واديارە لە کوتای ئەو دەمە تەقەیە دا کچە لە کەری شەیتان دیتە خوارەوەو دلی بو ( عەلی ) نەرم دەبیت جادەلی :

تو بو من چاکی من بوتو چاکم
تو خوشەویست تر لە هەر شەش کاکم

بەلای منەوە ئەو بەیتە نەختێ کەم وکوری هەیە لەناوچەی هەولێر بەیتێك هەیە زۆر کەس ناوی بوێژەکەی نازانێ بەلام لەکانی خوی من بەهی عەلیم زانیوەو لە نامێلکەی حەسەنو مریەم چاپم کردوە بەناوی « هەتیوێك بووم لە کاروانی » کەلە شایو هەلپەرکی دا دەی لین وە لەفولکلوری کوردیش دا بلاوم کردوتەوە بەلام چونکە لە هەلبەستەکەی سەرەوە رێكو پێك ترە بویە دیسان ایرەش بلاوی دەکەینەوە لەگەل ئەو هەلبەستە دا گەلی پیوەندی هەیەو رێكو پێك تریشە

« « «

هەتیوێك بووم لە کاروانی
لام دا مالێك لەبو نانی
دیتم زەریەك (١) لەبەر نانی
سەد ماشەللا چەندە جوانی
وەختە بمرم لە داخانی

کچ :

کورە کەچەل بگرە نانی
تو بەجیمای لە کاروانی

(١) زەری ـ کچ . کیژ

مەلی :

وەللا زەرێ نـاکرم نانی
کەر بەجیمـام لە کاروانی
هەتا نەت کەم راموسانی(١)

کچ :

کورە کەچـــەل برو لیرە
هەر حەفت برام بینە ئیرە
بەخە نجەران دەت .کەن کیرە!

مەلی :

وەللا زەرێ ناروم لـــیرە
هەر حەفت برات بینە تیرە
بەخە نجەران بم کە ن کیرە
هەتا مـــاچت نەکەم تیرە

کچ :

کورە کەچەل من قەلاتم
حەفت سالان چە ئاغەواتـان
هیچ بەردیـان لی نە بزافتم

مەلی :

تو قەلانی من لە شـــکرم

(١) راموسان ـ ماچ

حەفت سالان لەبنت دەورم
یان دەت کوژم یان دەتگرم

کچ :

کورە کەچەل ئەمن مـارم

عەلی :

ئەتو ماری من شــــە هینم
لە بن عەردی دەرت دینم
لە کن مەلای دەت کەو زینم

کچ :

کورە کەچەل من کوترم !

عەلی :

تو کــــوتری من کولارم
پەرو بالم بیستو چـــارە
لە ئاسمان دەت هینمە خوارە
لە کن مەلای دەت کەم مارە

کچ :

کورە کەچـەل وەرە پیشتر
دەمو لیوت کەلەی شە کر
ئەتو بو من لەبرام چیــــتر

# عەلیو پیرە ژنی شایەر

وادیارە کە ( میری سوور ) (١) زور ریزی ( عەلي ) گرتوە ، وە پایە یەکی گەلی بلندی لەدیوە خانی ئەو دا هەبوە . عەلي جاری لە دوورە وە دەردە کە ویت میریش بە خەلکە کە دەلیت : ( کی دەتوانی سەلاو لەبیر عەلي ببسانەوە من خەلاتی دەکەم ) .

کەس ناتوانیت بەلام پیرە ژنیکی شایەر دەبیت زور لە خو بای دەبیت دیتە کن میرو دەلی ( من ئەوە دەکەمو سەلاو لەبیر عەلي دەبەمەوە ) چونکە دەلین عەلي زور پیاویکي بی دەعیە بوە ئەگەر بکەیشتایە مندالیش سەلاوی لی دەکرد . .

( عەلي ) دەکاتە نزیك دیوە خان خەریك دەبی کە سەلاو بکا پیرە ژن ماوەی ناداو دەلیت :

عەلیە کویرەی بەردەشانی
کوچی کوچی نسانی نسانی

یان :

توری توری نسانی نسانی
دوو کونم هەنە لە بن رانی

(١) هەندیك دەلین میری سوور نە بوە ئاورە حمان یسان وەسمان پاشا بوە .

یان :

دوو کونم هەنە دەنیورانی
لە ئاو دەخوی یان لە دانی ؟

یان :

لەئاوی دەخوی یان لە دانی ؟

عەلی !

ئەی پیرە ژنی هەلیك مەلیك
هەردوو کونانت دەکەم بە یەك

یان :

ئەی پیرە ژنی هیکەو نیکە
هەردوو کونت دەکەم بەییکە
ئاوی ئاخوم دانی تیکە

یان :

لینگانت دەکەم بەسی پیکە
میری سوور سلام عەلیکە

یان :

پاشام سەلامن عەلیکە

« « «

سەلام عەلیك کوبەی شیران
دەیکەمە تەنگی (زەلتوبران)

لو بار گیری لی هـــەل دیران

« » « » « »

پیرە ژن زور بەخوی دادەشکیتەوەو دەلیت :

ئافەرین ( عەلی ) بو گوتنت
سەلکە تووریك بەبێ گونت
سەلکی بڕواو پـــەلکی بمینی
هەربا لیی داو بی شەکینی
بو کـــالتەی منالان بمینی

« » « » « »

جا کەمیر ئەو توانایە لەعەلی دەبینی خەلاتیکی زور بـاشی دەدانی . . . . عەلی قسەو هەلبەستی وەکوو تیژی تفەنگ لە ناو زار دا ئامادە بوە لیرە دا بەوینەی شیخ رەزا نکتە بازو بەلار وەشین دەبی . . . بەلام لەهەندی جیگا بە خراپە بـاسی خوشی کردوە ، ئەوەش بوورابواردن‌و پیکەنین‌و خوشی خستنە دلی خەلك بوە . بەو چەشنە فولکلوری کوردی هینانە بەرهەمی ئەو چەشنە شایەرانەیە .

عەلی‌و کچیك لە کاتی دار کردن دا

« » « » « »

جاریك ( عەلی ) دەچیتە ناو شـاخ بو دار کردن لەگەل چەند کەسیك دا لەویدا چاوی بەکچیکی جوان دەکەوی :

ئوفیقم بـــده یافه له ك
ئوفیقم دەی یا جه بیـار
یا پاشای په رووەردگـار
دنیا خوش‌نیه‌بی‌گوارەدار

— ٢ —

دنیا خوش نیه بی‌ی ناز داران
بەچەلەب هـاتووینه داران
ابی هەل کردبن تاویك بـاران
دەبا خوش بی بو قوماران

— ٣ —

یـا الله خوش بن هەر بمینن
نـاعیـلاجین ناویـان دینین
ناوی توم لەســـەر زاری یه
ددان زیـرو مرواری یـــه
ددانت وەکـــوو مـــرواری
رووەمه ت وەك گولی بەهـاری
تومـــەلەکی یـان حوری ؟

سەر گوزەشق
شابی دوله بی

« « «

وادەگیرنەوە کە ( کیخوا عبد الله ) یەك هەبوە لەگوندی « تەواران » ئەویش ناوبانگی بە شایەری دەرکرد بوو ، عەلی بریار دەدات کە بچیتە لای کیخوا عبد الله بو ئەوەی بزانیت تا چە رادەیەك لە هونەری بویژی دا پایەی بلندە . . . دیسان کیخواش ناو بانگی ( عەلی بەردەشانی ) بیستبوو زور ئارەزووی دەکرد کە ( عەلی ) ببینی . بو ئەو ئامانجە بەرێ دەکەویت بەرەو گوندی ( لوتەر ) بەو چە شـــنە عەلی بەرەو گوندی ( تەواران ) و کویخاش بەرەو ( لوتەر ) دەکەونە رێ . . .

لە پشت مالی « بیوەکە » (١) کە چـــارەکە ریێەك لە لوتەرەوە دوورە تووشی یەکتر دەبن ، ( عەلی ) لبی دەپرسیت : ( توکییت ؟ ) وە بو کوێ دەچیت ؟ خەلکی کام گوندیت ؟

لە وەلام دا کویخا دەلیت : ( من کیـــخوا عەولای تەواریم و ناوبانگی عەلی بەردەشانیم بیستوە دەمەویت بەخزمەتی بگەم ) .

عەلیش دەلیت : ( ئەگەر قبوول بفەرموویت من عـــەلی بەردەشانیم وە هەمان نیازی تـــوم هەیە واتە دەمەویســـت بەخزمەتتات بگەم )

هەردووکیان لەسەر تەپولکەیەك لە پشت گوندی « بیوەکە »

(١) دولەبی : گوندیکە لە ناوچەی مەرگە .
بیوەکە ـ بیوکە : دیسان گوندیکە لەو ناوچەیە .

دادەنیشن وە دەست دەکەن بە گفتو گو کردن . کیخوا عەولا داوا لەعەلي دەکات کە شتیك لە هەلبەستەکانی بو بلیت کە کەس نەی بیستبی وە زوریش خوش بێ ، کە بەهویەوە شایەری خوی پی بسەلمینی . . . جا عەلي ئەو پارچە هەلبەستەی شایی ( دولەبی ) بو دەبیژیت . . . واش زانــدراوە کە کیخوا عەولاش بەندیکی بو ( عەلي ) گوتوە کەباسي دانە ویلەو نیسکو نوکو شتی وای تیدا کردوە ، بەلام دەلین لەبەر ئەوەی کەوا خوش نەبوە بویە کەس لەیادی نەماوە . . .

ئەوەش هەلبەســتەکەی ( عەلی ) یە بە ناوی شایی ( دولەبی ) :

یاخــوا یاالله‌ی لە ســەر
لە ( اوتەر ) یم بەر یە دەر
جیگای شیخی خوش نەزەر
چەند لیی کەرام خو بەسەر

— ٢ —

خوبەســەر لیی کەرامە
مالکی شیخیم هەر شــامە

— ٣ —

شیخمان شیخ مصطفی یە
بو دیــنی بــەتەمایــە

— ٤ —

بەتـەمـایـە بۆ دیـنی
شیخیکی بـە یەقیـنی
لە « قولەغان » (١) بەقینی

— ٥ —

لە قولەغان بـە داخـە
(عەلا) قـە دیم وجـاخە
روژی کردمـان ســوراخە

— ٦ —

شـابی یە لە ( دو لە بی ) یە
کیژ دەگـرن چوپیـە
داك نـاكای لە کـورنیە
کاعەلی نـەی گەییـە

— ٧ —

لەو کاك ( عەلی ) سەودا سەر
سبەینی ئەهـلی سـەحەر

— ٨ —

صبحی بەیـان شـەبەق دا
ئنجـا دەروین انشـا الله

(١) قەلەغ : گەنج — لاو — جەوان

تـو كلـت عـلى الله
وەلداشمان كويخا ئەللا

— ٩ —

كويخا ئەللای ( ئەواری )
هێندی هێنابوو دیاری
عەلی برو بەیەك جاری

— ١٠ —

عەلی دەبرد بە تالو وکە
هەر ئاوە دان بێ بیوکە
دیبەکی بەنەرو نیکە
لێنی بەژن باریکە
لە ( او تەر ) نزیکە

— ١١ —

هەریەکی دووان دەکا
لەوی سەرەو ژێر دەبێن
هەروەکوو ئاکرو پووشووبن
بەخری سەراوی وەردەبێن

— ١٢ —

هاوینان چووره بره
زستانان بەخوره خوره

دەك بەڵات لیدا چەند بەدفەرە

— ١٣ —

رویشتنی دەم خر ورروو پارە
لە وی را هە تـا ئەوارە
(هەلپەتیو)ی(١) لی بوون هەزارە
دە وەنم لی بون بە دارە

— ١٤ —

هـاتم کەییمە ( بیکمی )
لینی بەرزو بلندو چاوکەرمی
بە مو کارەش (٢) ناسمی

— ١٥ —

هەر لە ئـەوی بەو لاوە
دە م خویندن بە ندوپاوە
ئیستاش( شارە ستین) (٣)مان ماوە

— ١٦ —

ها تم کە یمە شارە ستینی

---

(١) هەلپەتیو ـ شیخەل ـ ئەمام
(٢) موکارە ـ شەیەکە بو هەل کولین
(٣) شارە ستین : دییەکە لە ناو چەی مەرگە کەلی پاش ماوەی کونی تیدایە .

رەبی بیی وانم نەژییف
خودایە بەندانم وەبیر بیف
زەینم لی نەپەشـو کیف
کارەکەم راستـم بو بینی

— ١٧ —

هانم کەیمە دولی (رەزەن)ی
کا (عەلي) لەوی پی دەکەنی
هەروەك کەوی سەرچەقەنی(١)

— ١٨ —

هیندە رویـیم گوتم پسام
لەناوە ریژیداوە ستـام
دولـەبیم لی بوو بەشـام

— ١٩ —

لیم بوو بەشامی مەنشوری
دارکەرهاتن لەریی ژووری
لیم دەپرسین بەزەرووری
بوکتان سوارکرد بومالیخەزووری

— ٢٠ —

(١) چەقەن : بەرزترین جیکە لەشاخ ـ یان جیکە پربێ لەبەردو کوچك بوکیلان نەشیت .

چا ماندوو بووم حەسامەوە
سیسیش بیووم کەشامەوە

— ٢١ —

گەیمە شەخسیك لە قەبرانە
لە سینگی دادوو فنجانە
شەدەو دەسروکەی لەملانە

— ٢٢ —

دەسرەو پوتەوو کلاوە
لە گەردنی بوون بەلاوە
باریکێکی بەلەك چاوە
بەخوف لیم دەکرد سلاوە
بەناز هەلیکی جواب داوە
« ماندو ونەبن ئەودوولاوە »

— ٢٣ —

هەردوو کلای کردین منەت بار
بیپا ریزی پەروەر دیگار

— ٢٤ —

ماندوو نەبن ئەی ریبوارە
شیلانە وکرمەك و گوارە
لەگەردنی زەردی دیارە

— ٢٥ —

له ویمان کرد چاك و خوشی
ئه‌حا (١) له‌دوو چاوی ره‌شی •
له کێ رووبین به بێ هوشی

— ٢٦ —

رووبشتم ئه‌وێ ده‌می یه
سه‌رم برده په‌نا گوی یه

ووتم :

« کیخو ئه‌للا ئه‌و کیژه کی یه ؟ »

ووتی :

« ئه‌تو شاعیریکی خاسی (٢) »
« له‌بنه‌ماله‌ی شاه عه‌باسی (٣) »
« چون ئه‌وی کیژێ ناناسی ؟ »
« خانمه کچی کاك ئه‌لیاسی ! »

— ٢٧ —

(١) ئه‌حا : ووشه‌یه که بو سه‌رسورمان به‌کاردیت
(٢) خاس - باش - جوان
(٣) شاعه‌باس - شایه‌کی یه‌ك جار خوین ریژو زوردار
فارسه‌کانه سه‌ده‌ها هه‌زاری له میلله‌تی کوردی ئیران کوشتو
به‌لام چونکه به‌ناوبوه کراوه‌ته نیشانه‌ی بو به‌ناو بانگی •

لەوخانمەی شلك و باریکە
بە ژنی رە یحانە ی فە ریکە
بەماچانن دە خە نیکە

— ٢٨ —

هاتین کە پیشتینە ( شار )
لەگەل کویخا بووینە عەنار
بە کولانان دا چووینە خوار
شاباش کەران کردیان هاوار
دیلان کەران دایان گوفتار
پەیدامان کرد توزو غوبار

— ٢٩ —

پەیدامان کرد توزو خولە
لیمان دا زور ناو دە هولە

— ٣٠ —

زور ناو دە هولم پە ساردن
بە ندی دە خورشم بژاردن
دیلان کە رم بە عام ناردن

— ٣١ —

دیلان کەران گوت کاك عەلی
لیدە گیژو گوردی کە لی

— ٣٢ —

کیژو کور شایی یه و قوله
تاقمیك دههاتن نه شمیله
ههر (خوازیله) یان تیدا قاییله

— ٣٣ —

لهو « خوازی » (١) لهی وا موعته بهر
چاروك سپی ده سمال به سهر
مه مکیکی دور ، یه کیان گهوههر
له نیویان نابم سهره و دهر

— ٣٤ —

سهرهو دهر نابم لهنیوێ
ههر ئاوه دانبی (دولهبی)
سی روژانم لی کردشای
نهمندال ما نه ردین سپی
ههموو هاتنه سهر کاك عهلی

— ٣٥ —

ههموو هاتن به هاتنێ
دهستم برد لهبو که ردنێ

(١) خوازی ـ خوازیله ـ کچیکی زور جوان بووه
دیاره یاری عهلی بوه ، لهکهلێ ههلبهست داناوی دهبات ..

یارم زەردەی دەهاتنێ

— ٣٦ —

یا اللە یارم پێکە نیوە
کەلەکەی منی بریوە
برینم ئەو دیو ئەو دیوە
ئالقەی زێرو گوارەی زیوە
لە ئەقل و زەینم چە قیوە
هێشتا چاکم نە پەچنیوە

— ٣٧ —

نەم پەچنیوە بەژنی یاری
لەجزیرە تا «بوتان» ی (١)
لەبوتانی تا «ژەنگار» ی (٢)
لە زەردەی دەعومباری
وەکوو خووناوەی (٣)بەهاری
هێندە حوری بینە خواری
جا ناکەن قەت هاوتای یاری

(١) بوتانو جزیرە ـ دوو ناوچەن لە کوردستانی تورکیە
(٢) ژەنگار ـ سنجارە
(٣) خووناو ـ شەونم ـ آوەنگە ـ خوزیشی پێ دەلێن

- ٣٢ -

کیژو کور شایی یه و قوله
تاقمیك دەهاتن نه شمیله
هەر (خوازیلە) یان تیدا قابیله

- ٣٣ -

لەو «خوازی» (١) لەی وا موعته بەر
چاروك سپی دە سمال بە سەر
مە مکیکی دور ، یە کیـان گە وهەر
لە نیویان نـابم سـەرە و دەر

- ٣٤ -

سەرەو دەر نـابم لەنیوێ
هەر ئاوە دانـی (دولەبی)
سی روژانم لی کردشـاي
نەمندال مـا نه ردین سپی
هەمو هاتنه سەر کاك عەلي

- ٣٥ -

هەمو هاتن بە هـاتنێ
دەستم برد لە بو گە ردنێ

---

(١) خوازی ـ خوازیلە ـ کچیکی زور جوان بوو ، دیارە یاری عەلی بوە ، لەگەلیّ هەلبەست داناوی دەبات . .

یارم زه رده ی ده هاتنێ

— ٣٦ —

یا الله یارم پێکه نیوه
کەلەکەی منی بریوه
برینم ئەو دیو ئەو دیوه
ئالقەی زیرو گواره ی زیوه
له ئه قل و زه ینم چه قیوه
هیشتا چاکم نه په چنیوه

— ٣٧ —

ئەم په چنیوه به ژنی یاری
لەجزیره تا «بوتان» ی (١)
لەبوتانی تا «ژه نگار» ی (٢)
له زه رده ی ده عومباری
وه کوو خووناوەی (٣)بەهاری
هینده حوری بینه خواری
جا ناکەن قەت هاوتای یاری

---

(١) بوتانو جزیره - دوو ناوچه ن له کوردستانی تورکیه
(٢) ژه نگار - سنجاره
(٣) خووناو - شه ونم - آوه نکه - خوزیشی پی ده لین

— ٣٨ —

نابن بە هاو تای « خوازی »
مال ویرانم بی بالا بە رزی
یار دیتە وە لە ریی حە وزی
نازی دەکا لە سەر عەرزێ

— ٣٩ —

بەژنی یاری شلك و شە لالە
ردین سپیان گالە گالە
خواکەی ژنمان بینەوە مالە
لەبرسان مردن مندا لە !

« » « » « »

## دووتی بینی

١ — بەلای منەوە ئەو هەلبەستە یەك جار لەوە زور ترە
چونکە ئە نجام نادا بە دە ستە وە ، هیوام وایە لە دوا روژ پاش
ماوە کەمان دەست کەویت . .

٢ — هە روە کوو لە پە را ویز دا باسمان کرد بوو گ
« لوتەر » ، « بیوکە - بیوەکە » ، « خری سەراو » ، « تەوار »
« بیکمە » ، « شارە ستین »

گەزدە سوور ، « دولەبی » ، « سیناچیان » ، ناوی ئەو دیو شوینانە یەکە لەناو چەی « مەرگە » ن ، گەعەلی لە گەشتە خەیالیەکەی داپی‌یان دا رویشتوە ، لەلوتەرەوە هەتاکوو دولەبی گرینگی شایەری عەلی ئەوەیە : کە توانیویە بەبی دیتنی ئەو شوینانە وەسفیان بکات هەموو شی بویە بوە کە خوی بەسەر کوبخا ئەللادا زال بکاو بوی دەربخا کە لەو شایەر ترە . . چا ایرە دابە هونەر مەندی عەلیمان بو دەردەکەوی .



# خوازی ـ یان خازی

«» «» «»

مەرم ئاویَ سەد هەزار بێ
مالم ئاوی گاوو بار بی
بارگیری بورمم خەلات بی
کولاوی سەریم کولەزار بی
خواردنی‌روژیم ژەهرە ماربی
هەر ئەوند (خوازیم)لی‌دیاربی

— ٢ —

لیم دیار بی لە هەموو جیَ‌یان
مەمکی وەکوو سیوو بەهییان
راوەستاوە لەگەل سییان

— ٣ —

راوە ستاوە لە گە ل کیژی
ئە گە ر خودا من نە کوژی
دەچمە سەر شای بەئاوەژی (١)

(١) ئاوەژی ـ پیچەوانە

له بو چوونی زور به وازم (١)
له ســــه ر یاری خوم به نازم
چووم هیمه تیی لی بخوازم
« « «
لیم خواستبوو ئیزنو هیمه ت (٢)

---

(١) وازم - به عه جه له م .
(٢) ئه و هه لبه سته ش زور که مه داخه که م هه ر ئه وه نده م ده ست که وتوه تکایه هه رکه سی هه ر هه لبه ستیکی له وانه ده ست ده که ویت بومانی بنیریت .

## عەلیو دلداری

«» «» «»

( عەلی ) زور دل تەر بوە هـــەر بویی دوو بەشـر هەلبەستەکانی باسی دلداری دەکات . دەلین حەزی لە ( خازی دەکرد ، خازی زور جوان بوە پیـــش ئەوەی مارەی بکا زۆر هەلبەستی لەسەر داناوە لەو هەلبەستەی خوارەوە دا باسی ئەو دەکات کە چون جار جار دەستی دەکەیاندی ! بەدکار نەیان هیشتوە بەئاوات بکا بەلام ئەو هەلبەستە نکتەو پیکەنینیشی تیدایە

«» «» «»

( خوازیلی ) کەلەك جوان بوو
جی ژوانمان ئەندو وریـان بوو
کاوو پـــەیـــی لی رژاو بوو

— ٢ —

لیـــی رژابوو کاوو پەیـن
قولمان بو یەك کـردە سەرین
دەمان مژین شەکرو هەنگوین
ئەڤ خوشی وامان نەدەدین

— ٣ —

تیك هالا بووین وەك شوقـاقـان
سەرمان كەووت بە دەلاقان

— ٤ —

هەستیك دەهات لە لە چـــە رێ
لیم ئاو دەدایە خـــە نجەرێ
دەمگوت كێ یە لە ویندە رێ ؟

— ٥ —

دەیگوت كاكە من ( سوارم )
لە میژە لەتـــو داخ دارم !

— ٦ —

دەم گوت كورە كاكە ( سوارە )
مەم كە بە دوژ من و مـــارە

— ٧ —

لەوی دەمان كرد چنگە رنە
كە ندویكمان كرد سەرەو بنە

— ٨ —

( سوارە ) چریـــكاندی هاوار
جیرانی كردن تاكـــا دار
كومپال بە دەست هاتن بەغار

— ٩ —

دایان کوتام چوخماخــــلی
هەر بە میـلی ئاســـنگەری
وەك ساواری ( مام خدری )

— ١٠ —

لەوی راهات ( حەمەمەرگەیی )
ئەو سەگ بابەی رەنگ نەلەیی
هێندی لی دام قالبم کەیی (١)

— ١١ —

لەولای راهات « ووسو پلینگێ »
کوپالیکی پی‌یە پر بە چەنگێ
نە ســـەرم دیلی نە ســـنگی

— ١٢ —

لەولاش راهات خال « خدر » •

---

(١) هەندی کەس دەلین « کاکە سوار » ناویك حاز
لە « خازێ » کە خوشە ویســتی « عەلی » بوە دە کرد ، بێ
رەقبی بوە ، هەر ئەویش بوە هاتوتە جێگەی ژوانێ بەنانە
وەخەلکی لی هانداوەو ویستویە « خازی » بو خوی بیا وابز
بو نکتەو رابواردنو خوشی باسی ئەو کارە ساتانە ی کردو
لەپیناوی « خازی » تووشی هاتوە . .

ئەو برادە ریکی نــادرە
لە هەموانیــش خرابترە

— ١٣ —

لەولا دەهات « حەمە خیسە »
ئەو سەگ بابەی پانە لیســە
بە خەنجەری لیم رادەســا
بە نوچێ دوخێنی دەپســا
بلحێ مەردان هیندە بەسە

— ١٤ —

جوابیان برد « بو مام قادر »ی
ئەو حیز بابی چوخ چــاتری
وام زانی لە هەموان چــاتری
یاخوا لەبەر ژنی خوت مری
هەر لە دوور را دام دە کری
بەمیسال دەلیی کــافری !

— ١٥ —

لە پاش ئەوهات« مەولوود گاوان»
کە دەرپەرییبوو لە ئاوان !
هیچی نەدیبوو بە چــاوان
کووی رەق ببوو لە لغاوان !

لبی نه ده بووه به حه‌فت ئـاوان
بابوت بکه‌م باسی پیریژنـان
ده‌رپه‌رین لیم له قوژبنـان
ده‌بیان گرن هه‌ردوو کـونـان
یه‌ك به کیری یه‌ك به کونـان !

— ١٦ —

له‌و پیره‌ژنـــه‌ی ده دونیـــایه
لیم خر ده‌بوون له بیـــلایه
ســـه‌ری که‌ربیان به حه‌یایه
ده‌که‌ن لومه‌ی مـن و بابـــه
کونه حیزی خویان وه‌بیر نـایه

— ١٧ —

چه‌پوکیان به خوازیلی ده‌کیشان
هیچ دارم هینده نه ده‌هیشـان

— ١٨ —

ئه‌نگوستی‌داکی « خوازی »م‌به‌ریشه
ئه‌نگوستی وه‌کوو دریشـــه
هه‌رچه‌ند جاری له‌«خوازه»ی‌دینایه‌پیشه
به هه‌موانم به‌قه‌د ئه‌وی نه‌دیشـا

— ١٩ —

ئەوجار دەهات « مام باپیری »
دەی گوت :
« لیی گەرێن لەوێ فەقیری »
« ببیەن بۆ خزمەتی مــیری »
«بلێن بە هیلاك چوو لەسەر كیری»!

— ٢٠ —

ئەوجا حەمەد بەگی نادر شایی
لەسەر مێیەبووخوێنیكی‌بیست‌وچاركایی
لیی ئەدەستاندم چەئاقەشایی
هەندی كەس دەلێن ئەو بەندەیەئەو
وچەشنەیە :
جوابیان برد بۆ خـــال باپیری
ئەو دەهات بەخۆیو شـــیری
قســـەی دەكردن بە زویری
چوو داوە لەوێ فـــەقیری

— ٢١ —

جواب لە « سیناجیان » گەرایەوە
دەلێن ئەو شـــەو كـــیرایەوە

— ٢٢ —

فەرمووی میری بەلەك چـــاوە

ئەوەی بلی « عەلی » مـــاوە
خەلاتی دەکەم مال ئاوا
— ٢٣ —
ئەتاقە پوولی لی ستاندم نە دینار
بوی دەناردم جووتی کالەی
شـــەمامە بەندی بە دوو ریال
« « «
« عەلی » ئابایی صـــوحبەت چی و قسە خوش بوە ئەو کەسانەی لیرە دا کە ئاوی بردوون لەوانەیە هەر دوســتو برادەری خوی بوو بن ، بەلام لیرە دا گرینگ ئەوەیە هەر کەس باسی کردوە کەم و کووری بەکی بو هەلبەستوە ، لیرە دا هونەری عەلی و میللی بوونی هەلبەستەکانی دەردەکەوی بەلام بەداخەوە ئەو پیاوانە هیچیان نەماوە کە مروڤ بزانی ئایا ئەو شتانە کە عەلی باسی کردوە وایە یان نە ؟

بەلای منەوە خەیالی بویژ لیرە دا دەوری گرینگی بیاری کردوە ، ئەگەر بیتوو وینەکیشی هونەر مەند ئەو دیمەنانا بکا وینە بەك جار جوان و بەنرخ دەردەچیت .

## خاوەنی کەوشی رەش!

جووتی کەوشی رەش هاتن
لە سلیمانی در وا وە
ژێریان چەرمی کامیشە
ناو فەرشی چەرمی خاوە
قوربانی وەستاکەی بم
شفرەی پیدا هیناوە
شاگرد بە حەیرانت بم
وردم تەربیت داوە
هێ کولەی پیسەی خەسیسە
چیت لە یارێ من داوە
پەستەك وەکوو شەداوی
لەشان و ملت نالاوە
رانکت دەلیی فستانە
لە قاچ و قولت نالاوە
ئەگەر یاریم نا نامن
باریکەو بەلەك چاوە
قەدی نەمامی عەرعەر
لاولاوی تی نالاوە (١)

---

(١) ئەو هەلبەستە ئەنیامە قطعەیکە وبەس .

## تیری دلداری !

ئه و جاره ی واقع بوو ئه‌قدیر
له جه رگی دام خه نجه رو تیر
مه وته نی خوشم چوو له بیر
دیسان خوازیله

قوشه نم نـاوێ هه زار بێ
ئیستریم ناوێ قه تـار بێ
که نج و چه‌واهیری بـار بێ
هه‌ر چاوی خوازیلیم لێ دیار بێ

— ٢ —

ته ندوور بانی به‌سه‌رو سه نگین
لیم بوو بوه ما فووری ره‌نگین
باسکمان بوبه‌ك کردبووبه سه‌رین
لیکمان ده‌مژی شه کرو هه نگوین
له وێ نووستین به دل و یه قین

ئه‌و دوو پارچه‌ی سه ره وه وابزانم چه‌ند پارچه‌یه کن له هه‌لبه‌ستی یان به‌یتیکی دوورو دریژ چونکه هیچ کاتی هه‌لی له‌ساد به‌ند که‌متر به‌یق نه‌وتوه .

## ڕەمەزانو عەلی

عەلی :

نە تەرزاوم نە زور دارم
ماچێکم دەبی ڕێبوارم

کچ :

لەو هەتیوەی ناو کرانە
بەو عەردەی کەم بەو عاسمانە
لە سەر سینگم دوو قنجانە
هەردو دەورەی کلیل دانە
لە ناقار تو بی پاوانە
بەلام چی بکەم ڕەمەزانە (۱)

(۱) ئەو دەمە تەقەیەش زور کە ئەو گومان نیە کە زور دوورو دریژ بی بەلام هەر ئەوەندەم دەس کەوتوە .

## بەیتی هەنار !

« « «

هەی هەنارو هوی هەنـار
بە دولی دا چرومە خوار
گەیشتمە « قوریجەی »(۱) نازدار
بانگم راهیشت هوی هە نار

— ۲ —

ئیکی تـرش‌و ئیکی تـار
هە مووی نە خوش و تـادار
بە جاریك بوم هاتنە خوار
بەجوم دەدا ئیكو چـار
بە گەنم سەر بەسەر روەك پار

— ۳ —

بانگم کردی رەش ئەسمەر

---

(۱) قوریجە : گوندیکە لە دە شتی « بیتوین » لە نزیکی شاری « رانیە » یە .

چاو رەشی ئەبرو سەقەر
سەر لە چیغی بینە دەر
بوت پی دەدەم سەر بە سەر

— ٤ —

هەنار رووی بە ئالان
لە بەر جوانی چاو کالان
کەوتە دەستی مندالان

## لەگەل تومە

لەگەل تومە ئەی مەستی چەم
سەری کولەت بگرم بە دەم
تو خاتو زین من کاکە مەم
هانایەت وەبەر دەبەم

# هانایەت وەبەر دەبەم

یا « موحەمەدی » « مەدینێ »
فەسلی یارم راروێی
دەچوو بو گول چنینێ
تەماشای بەژنم دەکرد
بە چاوی کا کرێنێ
غەدەنگی عیشقی تیژ بوو
لە دلم دەکا برینێ
بێ مەلای دواز دە عیلم
لە سەرم بخوێنێ یاسینێ

# چیغو رەشماڵو چادر

« « «

چیغو رەشماڵو چادر
ئەو گورجن بو بوو هاری
کە لە شاخان را دە ژان
تەربوون لەگەل خوساری
رەوەکی قولینگ و سیبان
کە بنین لە کولی نیان
لەوینده ریش نە نیشتن
لە ترسی ئەفەنگ چیان
دەچوون بو وان کە رماوان
توره وانیک بە پدابوو
هەمووی کرت بە شەداوان
کە ئەو جوابە بو من هات
ئاگرم بە ربوە هەناوان
ئاگری جەی لە چە شخوری
سەید « سمایل » ی کویستانی

یا دوانزده مامان هاوار

غەوسی مال اە بە غدایی

ڕەبی کاربکی وابکەی

جووت بین لە گەل لە یلایی

سوور گول لە من سوور دەبوون

دەشتی پیرە ریا لی

چاوی شەیتانان کور بی

زمانیان گەری بە لالی

نەیان هیشت بینین خوشیان

پییان نیشان داین تالی



## بوچی ( عەلی ) قینی لە پیرە ژنان بوتەوە ؟

وەکوو بومان دەرکەوتوە ( عەلی ) بەردەشانی زور رقی لە پیرە ژنان دەبووە ، چونکە هەمیشە پیرەژنەکان لە دیهات و شار دا لە جێگا کان دا شەوانە کودەبنەوە دەست دەکەن بە قسەو باس دوروست کردنو بوختان ، چار جاریش قسە کانیان دەبێتە هوی ناتەوەی ئاژاوەو کیچەڵو کوشتار بووبە لە چیروك و ئەفسانە کانی کوردی دا بە چەشنی دیوو درنج ناویان بە خراپە براوە وە مایەی شەرو بەدبەختین وە لە جیگەی ئەهریمەن ( خوای خراپە ) داندراوت . . عەلی لەگەڵی هەلبەستی دا باسیان دەکات بە ناوبەتی ئەو پـــیرە ژنەی کە یار لە دلدارەکەی هەلدەگیریتەوە :

« » « » « »

پیرە ژنەك لەو لای راهات<br>رەشـــە وەکوو مەنجەلی<br>شینە وەکوو دووکەلی<br>یارم لی هەلدەگـــیری<br>بو ئیکی دی پی دەلی

هه‌ش و مشـکی قوته‌ری
به‌ سـه‌ر پیره‌ ژنان گه‌ری
پیره‌ ژنی سـه‌ر تراشـاو
له‌بو فتنـه‌و گیچـه‌لی
ده‌سکانم له‌ دوا ده‌کـا
له‌کول قوونیم ناگه‌ری ! !

— ۲ —

پیره‌ ژنی ده‌وی گوندی یه‌
هه‌موو کوته‌ك به‌ چنگیه‌
مشته‌ی دو میان به‌ قوزیه‌
ده‌که‌ن لومه‌ی کاك ( عه‌لی ) یه‌

— ۳ —

پیره‌ ژنه‌ کویری بی ددان
مایه‌ی فتنه‌ی ئاخر زه‌مان
مایه‌ی فتنه‌یه‌ خزمینـه‌
مه‌میش هه‌ بی خـاتو زینه‌

— ٤ —

باری تری و هه‌نجری ته‌ر
پیره‌ ژنه‌ کویری ئه‌هلی شه‌ر
سه‌د مه‌سحه‌فیان بو بخوی به‌په‌ر
به‌ هیچ قسـان ناکه‌ن باوه‌ر

# دوعای عەلی بو بەدکار

بەلای منەوە ئەوچەند بەندە ئە لسەئە یەکی زور قوولی تیدایە بەلام بە شیوەیەکی سادە و میللیانە کە مروڤانی ساکار بە چاکی لیی حالی دەبن . . . ئەوەش ئەوەیە : لەسەر دەمەکانی کون دا یەنی لە دەوری قوناغی دەرەبەگایەتی دەتوانم بلیم تا روژی ئەمروش لە زور ترین بەشی کوردستانی مەزن دا : مالات ، رەزو باغ ، کاوو گول . . . گرینگ ترین سەرمایە بوە جا هەر کەسی ئەوانەی لە دەست چووبیت کەوتوتە سەر ساجی عەلی ونەداری کوشتوویەتی بویە عەلی دەپاریتەوە کە بەدکار ئەوەی بەسەر بیت :

« » « » « »

ئەگەر بەدکار لی بکەری
گورگ دەگەل پیرە مەری
چەهەندەم چی دی ناگری
گورگ دەگەل پیرە مەری
گەر بیگانی لە لەوەری
چی پی نالی لیی دەگەری

— ٢ —

چی پی نالی ساقی ساقی

گورگ و مەرو کەرو بزن

وەك عەشیرەتان یەك دەبن

— ٣ —

یاخوا بەدکار هەر بەری

کەری لە کیوان بخوری

رەزی نەگری بسارەك تری

مانگای پیری و کەل نەگری

— ٤ —

یاخوا بەدکار چەقل و بەردی

هەتا مردن بە نەحلەت بی



# عەلی‌و سی برادەری

چاریکیان ( عەلي ) لەگەل سی برادەری دا دەنیشن وە هەر یەکە رازی دلی خوی بویەکتر دەلیت :

یەکەمیان دەلیت !

« بەخوا خوش بوو هەزار مەرم ببوایە »

دوەمیان دوەلیت :

« بەخوا خوش بوو هەزار ئەسپم ببوایە ! »

سی یەمیان گوتی :

« من زور دلشاد دەبووم ئەگەر ببام بە وەزیر ! » (١)

جا نورە دیتە سەر عەلي کە بیری خوی دەربری ئەویش بەو پارچە هەلبەستەی خوی وەلامیان دەداتەوە :

هەزار مەرت بی لەسەر کاسە ی شیری
هەزار ئەســپت بی لە رەوە ی میری
دام‌و دەزگـــات بی وینە ی وەزیری
بەهەموان نـابن بە حەملە ی گیری !

(١) بەداخەوە ئەمرو شەرو جەنگ لەسەر کورسی و پـارە کەبشتونە رادە یەك برا برا دەکوژی تەلارو زیر چاوی هەموانی کویر کردوە !

# بەیتی پیوازان

( عەلی بەردەشانی ) لەگەل هاوری یەکی کە ناوی « محمد »
دەبی لە مەرگە لەمالی کویخا ئەللا بسانگ هیشت دەکرین بە
چیشتی ساوەر لە کاتی خواردن دا « عەلی » داواله « محمد »
دەکا بچی بو لای پوورە « بیرێ » کە پیرە ژنیکی بەسالا چوەو
زور بەخیلە وە دراوسێی مالی کیخوا « ئەللا » دەبی ، هەندی
پیاز بینی . . .

« محمد » دەچیت بو لای پووری هەرچـــەند داوای لێ
دەکات چە بە هیمەت چە بە قیمەت هەندی تەرە پیوازیان
بداتی بەلام پیرە ژن قبوول نـاکات ، « محمد » بە ناچاری
دەگەریتەوە وە قسەکە بو « عەلی » دەگیریتەوە عەلیش دەلیت:

« قەیناکا دەردی پیرە ژن لە کیانم ، ئەوەی لەسەر ناچی
خوم دەزانم کە ئەو تولەیەی چون لی بکەمەوە ! » هەندیکیش
دەلین : ئەو باسە لە گوندی « گەنـاو » ی دەشتی « بیتوین »
قەوماوە . . .

« عەلی » و « محمد » بریاریان ووها دا پاش نان خواردن
رەش بەلەکیك ساز بکەن کە ئەو سەرو ئەو سەری دیار نەبیت

« محمد » بچیتە ناو پیوازەکانی پیرە ژن ، وە عەلیش سەرچوپی بگریت وە بەنددان بخوینی . .

لە هەوندی کە سمان بیستوە کە « محمد » شاگردی عەلی بوە لە هەلبەست دا چونکە لە و سەـــفردە مانە دا ئەو بویژانە هەریەکەی شاگردیکیان لەگەل بوە جا چە بویژ بوو بیت یانە ، بو ئەوەی کە بەندەکانی بو بگیریتەوە وە فیری شایەریش بی من خوم لە گوندی « ئالوە تان » لە کوردســــتانی ئیران ناوچەی « مەنگوان - وچاغ چـاوم بە پیاوەکی شـایەری زەبەردەست کەوت کەناوی « عەولا مامەش بوو » کوریکی خوی لەگەلدا بوو ئەو بەندی بو دەگیرایەوە ، ئەو پیاوە لەعەلی بەردەشـانی کەمتر نە بوو دەیتوانی چەند سعـات لەسەر یەك هەر بەیت و هەلبەست دابنی بێ راوەستان بەلام داخەکەم ماوەم نەبوو لەیەك شەو دا سەدەها بەیت بنووسمەوە . . .

جا بابینەوە سەر باسەکەی خومان . . .

دوای نان خواردن « عەلی » شایەکی زور مەزنی ساز کرد ، « محمد » یش چوو بوو بو ناو زەوی پیـازان ، بەلام پیرە « بیری » ئاگای لە و پیلانە نە بوو ، بویە هاتە کوری هەلپەرینەوە لە هەموو کیژو کارەکان بەگور تر هـەلدە پەری . « عەلی » لەگەرمەی شـاییە کە دا دەست دە کات بە بەند کرتن وە محمدیش بوی دەگـیر تەوە ئەو کفت و گویەی خوارەوە

بەمەلبەست دوورست دەکەن :

هەلی :

کاکە ( حەمە ) ی رەنگ چەکەنە
برام ( حەمە ) ی رەنگ چەکەنە
کوارە و کرمەك و بەربەنــە
دوو بیی لەســەر سینگی هەنە
چیم پێ گوتی هەلیــان قەنە
ئەی سووری لەبەر نازی دەتو (١)
سوور گولی لە باغانـ چەننەتە
بەتەنـ تەنە بەتەنـ تــەنە

وەلامی « حەمە » :

هانام بەو شیخەی ئەشکەنی

یان :

بەو شیخەی کەم لە ئەشکەنی
دلم کولکــی دارە بــەنی
پیواز رەقــە و هــەل ناقەنی

یان :

---

(١) دەتونــەو « دە » یەزیادەیە تەنیا لە شیوەی مەرگەو نــاوچەی سەردەشت بەکار دیت .

بنیان رەقەو هەل نساقەنی
ئەی سووری لەبەر نازی تو
سوور گولی لەباغان چەننەنە

عەلی :

کاکە خوتو چاوت هەیە
برا خوتو چـــاوت هەیە
جوگەی ئـاوی لەوی وەیە
بەری بگرەو بەریـان دەیە
لاسکیان بگرەو سەلکیان هەیە

یان :

جوگە وەنا لە پشت خەتی
پێی پیدا دە ئـاوی دبق
دەسیان دەبی بە بنەوەدی

«» «» «»

سەبر ئەوەیە کە پیرە ژن هیچ لەو مشتەو مرەی نیوان ( عەلی ) و ( محمد ) ناگات وە زیاتر بە جوشتر دەبی لە هەل پەرکی دا . . .

لیرە دا عەلی داواله « حەمە ـ محمد » دە کا کە بچیت گورپس بهینی :

«» «» «»

بە ئایەتی مام جەدریسی (۱)
بە قورئانی مام جەدریسی
دەبچو مالی مام ئبلیسی
کیچ هەل نیشتوون لە سەر لیسی (۲)
هەرلەوی تاو دە گوریسی
ئەی سووری لەبەرنازی دەتو
سوور گولی لەباغان چەنتە

حەمە :

ها نام بە شیخە کەی کوسە
قسان دەکەم بەهەوەسە
باوە شیکان بینم بە سە ؟
ئەی سووری لەبەر نازی دەتو
سوور گولی لە باغان چەنتەتە

« » « » « »

وادیارە عەلی باوەشی پیازی لە لاکەم بوە بویە بە حەمە دەلیت :

حەمە کاکت لەبەر مری
کە لە خیزانی دە نکری

(۱) جەدریسی ـ پیاویکی ئایینی بوە ٠
(۲) لیس ـ خرار ؟

دەبی کەری یان هەل کری
ئەی سووری لەبەر نازی دەتو
سوور گولیم لە باغان چەنتەتە

« » « » « »

حەمە لە پیاز هەل قەند نەکە دەبینەوە وەبە ریك کەوت
مالی خانە خویەیه کەیان لەبیر دەچینەوە کەلی میوانن :

حەمە :

هانام بەو شیخەی « مەروێ » یە
چەند گــە راوین دی بە دی یە
مالمــان لە بەری مــەرگی یە
کاك عەلی خانە خوێی کێ یە ؟
ئەی ســووری لەبەر نازی دەتو
ســوور گولی لە باغان چەنتەتە

عەلی :

کاکە حەمە توم کیچە لی
باند دەبی وەك خەرتەلی
قولپان دەدەی وەك مەنجەلی
بچو مالی ( ئەللا ) کەچەلی
ئەی سووری لەبەر نازی دەتو
سوور گولی لەباغان چەنتەتە

حەمە پیوازەکان بەکولی خوی دادەداتو دەگەڕێتەوە مالی

« مام ئەللاکە چەلی » کە دەگاتە بەردەرگا دەلیت :

هانام بەو شیخە کەی تازە
قاچم شل بوون لە دوروازە
مام ئەللا کولم پیوازە

«» «» «»

پاش توزیك پشوو دان ( حەمە ) لە بەر چرا دا چاوی بەچلو بەرگی خوی دەکەویت کە سە رنج دەدات هە مووی بە قور بوە ، چونکە ئاوی بە ردا وە تە وە ناو پیازان بو ئەوەی کە هە لیان قە نی ، دیسان پیازە کانیشی بە کولی خوی دادا، بو مالی مام ئەللا چا یەکە میان لەشەرمانو دووە میان بو ئەوەی پیلانەکەیان ئاشکرا نەبیت بویە بە عەلی دەلیت ئیتر من ناتوانم دوو بارە بیمەوە ناو شایی :

وەك چووشتیرەکەی تازە زاوم
وەکوو مانگای کەل لی براوم
بە عەمەل شایی نەماوم
ئەی سووری لە بەرنازی دە تو
سوور گولی لە باغان چەنتە

«» «» «»

عەلی :

بە ئایەتی مام (سلیمان) ی
بچو مالی مام (قوربان) ی
دوو چلان بێ لە ناو نانی
لەرزت دەردەچی لە کیانی
ئەی سووری لەبەر نازی دەتو
سوور گولی لە باغان جەننەتە

«» «» «»

بەریك کەوت (ەەلی) سەیری لای پیوازەکان دەکا لەبەر نیشکی مانگە شەوی سەوزاییەك لە ســـووچیکەوە دەبینێ وا دەزانیت کە هەندێ پیواز ماون کە حەمەهەلی نەقەندوون دەلیت:

بەو خالقەی بە حـــەواوە
ئەو شـــینایێەی تیدا مـــاوە
پیوازە هەل نە قە ند راوە
ئەی سووری لەبەر نازی دەتو
سوور گولی لەباغان جەننەتە

حەمە:

بەو خـــالقەی لە حەوایە
ئەو شینایێەی تێی دامـــایە
هەموو توورە زەلەو کیـــایە
تەرکم لە پیرەژنی دایە!

ئەی سووری لەبەر ئازی دەتو
سوور گولی لە باغان چەنەتە

«» «» «»

چەند تێبینی :
ئەوەی کە لێرە دا پێویستە باسی بکەین ئەوەیە :
کەوا مروف باش نازانیت ئایا ئەو بەیتە هەمووی ر
( عەلي ) یە یان بەشی دووە میان هی ( محمد ) ە هاوری یاز
شاگردی بوە ، جا ئەگەر ( محمد ) یش بوێژ بوە بوچی هیچ
هەلبەستی تری لەپاش بە جی نەماوە ؟ چونکە ئەو بەشە ش ل
هی بەشەکەی عەلي کەمتر نیە ، وە پیشانی دەدات کە ( محمد
شایەریکی دەست دار بوە ، جا لەوانەیە ئەو ( محمد ) ە شاباز
بووبیت بەلام زور بەناو نەبوە وەکوو عەلي بویە هیچ هەلبەستیکی
تری لەپاش بە جی نەماوە ، یان ئەو خەلکانە مردوون ک
هەلبەستەکانی ئەویان لە بەر بوە وەکوو سەدەها بوێژی تر
کەس ناویشیان نازانی . . . سەدەها بوێژی میللی بەوچەشنە
هەلبەستو بەرهەمەکانیان (۱) لەناو چوە ، جا بو ئەوەی سامانی
نەتەوایەتی کورد لە ناو نەچیت پێویستی سەرشانی ئیمە ئەوەیە

(۱) بەلام بوێژانی « نشـــقیات » بە ئازادی هەلبـ
ســـتەکانیان لە روژنامەکانی کوردیدا بلاو دەکـــەنەوە گوایـ
« پیشرەون — باغین » !

كە ئەو بەرهەمانە كوكەينەوەو بەكورجى چاپيان بكەين ، چونكە ئەو هەلبەستە ميلليانە چەرخو دەمو خوو رەوشتو ميژووى ئەو سەردەمانە دەخاتەوە ياد وە باش بومان دەردەخا كە ميللەتەكەمان لەو دەورانە دا چون ژياوە بويە ئەدەبى ميللىو فولكلور ئاوينەى بەدەرخەرى ميژووى رابردووى كەلەكەمـــانە كە رچى هەندى نەزان دەلين :

« ئيمە لەسەدەى بيستەم دەژين ئەو شتانە باويان نەماوە ! »
سەلا لەهوشو بيرى منالانەيان بى ئەو كەوجانە ! !



# بەیتی تفەنگ (١)

( عەلی بەردە شانی ) داوالەوە ستا « سـیـد احمد » ی چەخماخ ساز دەکات کە تفەنگیکی وەك خوی دەیەویت بوی دورست بکا ، جا عەلی بەهوی ئەو تفەنگەوە دەلیت :

تەماشای مەکە تەماشـای ناوی
تەماشای مەکە بەقلینچکی چاوی
عالەم دەزانی وەستای تەواوی

« » « » « »

تفەنگیکم ناوی ئـاسنی زور بی
رەق و رووتی دەرمـان خور بی
منەتی لەسەر شـانم زور بی
نـالەی وەکوو کورکی بور بی

« » « » « »

تفەنگیکم دەوی ئـاسنی چـابی
نالە نـالی لە شـاخان بی

(١) ئەو هەلبەستە ماموستاو بویژی مەزن ( روشنە ) ؛ بوی ناردووم .

قابیل بەنیەبە کیویان بێ
سەد جار عەلیت بە قوربان بێ

« » « » « »

نیشانەی دانی‌ی لە بەری « پیریشکی »
پریشکی گوزەو بازەری کویریشکی
لەسەر « کوچاری » شەر بەی پی یشکی

« » « » « »

نیشانەی دانیی لەبەری « بی دیلی »
باوی بە گوزەی شەربەی نەهیلی
نووره نووری بێلە بازوی « ئەسریل » ی

« » « » « »

نیشانەی دانیی لە بەری « بیرەکان »
پریشکی گوزەی بچتە نەلەکان
داخوازی بکا میری « بالەکان »
ئەمە چەکی ... عەلیەو سەر پشکی چەکان

« » « » « »

بەکالتەوە وەستا « سید احمد » ی چەخماخ چی بە عەلی بەردەشانی دەلی : « باشە من تفە نگیکی وات بو دورست دەکەم بەلام حەقەکەیم دەوی . جا عەلیش لە جیاتی ئەو حەقە ئەو عەلبەستەی بو دەلیت و ، باری ئابووری خوی بو دەلیت :

گەرە کم نیە بکا اوشە اوشـــی
بزنە کم نیە بخوا کەلە پوشـــی
مانکایە کم نیە کایان بی دوشی

• • •

نە وەســتایەك بووم لە ریزی تو
نە حـاکم بووم لە « کانی پەلکو »
مەفتای بالات بم بە قوربانی تو

• • •

پووتی شـــك نابەم نەحەفت ونەنو
نە گەر دەپرســـی حال و نە حوالم
وەك لە مالی هاتم تو تومەن قەرزارم

• • •

وەستا « احمد » یش بەعەلی دەلیت :
ئەگەر وایە وا مفلسیت بەزدیکی خوشم بودابی لە جبکەی
حەق دەستی تفەنگەکە جاعەایش ئەو بەزدەی بو دەلیت :

سەد مەرت هەبی کاسەی سەر شیری
سەد کاشت هەبی جووتی بن نیری
نە ختی پاشـــایی و نالەتی مـــیری
لای ژنان نابن بە حەملەی کیری ! !

• • •

دەتوانین بلێین عەلی بوێژی خوش مەشرەبو نکتەچیو ەی پیکەنین بوە یەنی شایەری دل خوش کەرەوە کە ئەو چەشنە شابەرە لەمەندی میللەتی تریش بەدەرکەوتوون وەکوو ابو نواس ئەوێژەی عەرەبی ، عەبیدی زاکانی لە فارسەکان بەلام ماناى ئەوەش نیە کە هەرچی عەلي ووتویە بو ئشقیاتو پیکەنین بوە ، چونکە گەلی هەلبەسق پر لەپەندو فەلسەفیشی هەیە ، هەلبەستە کانی وەکوو جوغرافیایە کەو میژوو شە ناوچەو باری ژیانی کوردەکان دەخاتەوە بیر لەسەدەی هەژدەم دا . . .



# تالان کردنی عەلی !

پیاوەکانی « حەمەد بەگی مەرگەیی » دەچن « بەردەشان،
تالان دەکەن ، لە پێشەوەش میر بەپیاوەکانی خوی دەلێت :
« دەخیلە دەست بو مالی عەلی درێژ مەکەن وە زمانی
ئەومان لی مەکەنەوە ! ! »

هەندی کەس دەلێن ! « یەکێك لە پیاوەکانی میر ناوی لە
مالی عەلی خواردبوەوە » هەندی تر دەلێن کەلە شێریکیان لە
ژنەکەی عەلی کڕیبوو ! ! بەرێك کــەوت لەو روژە دا عەلی
لەمال نابی . . .

کاتی کە عەلی دەگەرێتەوە بو مال هەوالی « تالان کردن
« یان باج وەرگرتن دەبیسی لام وایە هەر ئەوەش بوە » . . .
بەرەو مەرگە دەکەوێتە ڕیو دەچێتە دیوەخانی حەمەد بەگی
میر . . . پاش پشوو دانیك میر لی ی دەپرسی :
« عەلی خێرە وا بەشەپرزەیی هاتویتو چاوت دەرپەریوە!؟
ئەویش وەلامی دەداتەوە :

سالیك بوو قران قران
ژنیکم هێنا لە مەنگوران

داکی حەوت کچ و حەوت کوران

« « «

هەربوم هینـان میوژو هەنجیر
لە « دەربەند » و لە مەنگوران
کردەی من بوو بردەی کوران
هەر من هینام ئەوان ووتیـان بران
لە داخان هەر دوو چاوم دابچکران

« « «

میر پێی دەڵیت :

« بەراستی عەلی بویژیکی بەرزیت بەلام پیم بـڵی چیت دەویت ؟ یان چیت لی قەوماوە بوم باس بکەو مەترسە ! »

عەلی لەوەلامی میر دادەڵیت :

« میرم چیت لی‌وە شیرم پیاوە کانت هاتوونە بەردەشان و تالانیان کردوم ، وەمنیان هیناوەتە سەر ساجی عەلی ، ئیستاش هەموو شتەکانم دەویتەوە خوا ئەو زولمە هەل ناگریت ! »

میریش پیاوەکانی بانگ دەکات و لییان دەپرسی : « ئـایـا شتیکی مالی عەلیتان بردوە ؟ »

ئەوانیش دەلین : « نەخیر تخونی مالی نە کەوتووین ! »

بەلام میر لە سەر ئەورەشەوە بەعەلی دە ایت : « عەلی سەر حساب بە چیت رویشتوە لە شتوومەك بومی بژمیرە مـن بت

دەمەوە ! »

ئەلیش دەڵێت :

« میرم فەرمان بدە با میرزا بێتو ئە من دەیان لیم وبە ئەویش بیان نووسیت ! »

جا کە میرزا حازر دەبێ عەلی دەست پێ دەکاو دەڵێ

مالیك هەبوو لە ریزەی مالان

یان :

مالیك بووم لە ریزەی مالان

تیرە سوورەی سەر هەرزالان

یان :

تیرە سوورکەی سەر هەرزالان

کازو چەکوچ لە کەل نالان

مربەندو سندمی عەتاران

چەند دەست بو خچوکە مندالان

مەمووبیان بردن بە تالان

یان :

پاشام پاکیان برد بەتالان

چونکە هەندی کەس دەڵێن کە چوتە لای پادشای بابەز

« یان ئاورەحمان پاشا یا خود وەسمان پاشای برای ...

« » « » « »

نوجووتم دەکـــەرا هو بەهـــو
نو چـالم هەبوو کەنەو جـــو
یان :
بی خیــــلافو بی درو بـــو
سەد ئەغـارم کە نەو چـــو بو
ئەویش کـردەی بـابی تو بو
یان :
ئەویشـــیان بردن لە بوخو
یان :
پـاشـام بردیـان سەدەتەی تو
« » « » «
نوکە ندووم هەبوو پر لە سـاوار
وەبەریـان نـان تـــیرو خرار
هەموو یان لیك دا کردیان بەبار
لە نیویـان نـا ئەشیو مشـــار
« » « » «
ئەشی و مشـارو شەی خوریـان
بو ئەوانم دەهـات گریـان
یان :
برینگ لە گەل شـــەی خورین

بو ویم دەست کرد بە گوری یی

«» «» «»

گریانم دی بە مشـــتەری
هەروەك ( یاقووب پیغەمبەری )
یان :
گریانم هات بە مشـــتە ری
وەك یاقووب بو پیغە مبە ری

«» «» «»

حەددم نیە پیغـــە مبە رم
کلاو فوتە و تـانجی سە رم
بەشیان کرد لە بە رامبە رم
نـاعیــلاج گوتم عـافە رم
یان :
کولاوو دە سروکەو میزە رم
جلكو کەواو کـراس بەرم
بەشیان دە کرد بە رامبە رم
ناچـار بووم دەمگوت ئافە رم

«» «» «»

کردەوە بوو بوم وە گە را
حەفسە د سە رم بزنو مە ر

ئه‌ورداس پاچ و پی مه‌ره
خه‌لاسم کرد دوو گای له‌ره

« » « » « »

دوو گا له‌رم کرد خه‌لاسه
هه‌رچه‌ند پارچه‌ی خاسه خاسه
بو ویم هه‌ل کیشان هه‌ناسه

« » « » « »

ئو که له شیر ئو باروکه
ئو پیست په‌نیر ئو پاپوکه

« » « » « »

که‌ریکم بوو سپی کوی لار بوو
باری سووکی ئو ته‌غار بوو
رویی خراپی وورده غار بوو
له زور جی‌یان عه‌لی سه‌ر بار بوو

« » « » « »

ئوبارم هه‌بوو رون و که‌شك
ئو پیست په‌نیری ئیشکاو ئیشك

« » « » « »

حه‌وت دیزه‌م هه‌بوو قاورمه
له‌گه‌ل په‌نیری نه‌رمه نه‌رمه

میرم کی بەوانەی شەرمە ؟

«» «» «»

بیوورو کاسن و مە ساسە
بوویم هەل کیشان هە ناسە

«» «» «»

دەم کوت بم ناسن عەلیە کویرم
خومو دار عەساو کیرم
پاشا خوش بی پی ی دە بژیرم

یان :

هیچ نەمایە لیت وەشێرم
بەردەشانی و عەلیو کیرم
نەویش بو پاشای دەنیرم

یان :

ماوە ئەوە خومو دار عەساو کیرم
گەر دەوەوی ، ئەوانیشوو بو دەنیرم

«» «» «»

لەپاش ئەو بە یەنە حەمەد بەگی میر بە عەلی دەلی : دەنز
سال پاشابم ئەوەی تو حسابی دەکەی بوم نادریت ، باوکم ئەوا
نەختیك شتوومەکو پارەت دەدەمی نە تو دەنگو نەمن دەنگ !!

«» «» «»

هەندی کەس دەلین :

( میری سوور ) بەردەشانی تالان کـــردوە نەك حەمەد بەگ ، وە هەندیکیش دەلین : نەمەسەلە تالان کردن بومو نەشتی ووها قەوماوە تەنیا هەندی لە پیاوەکانی میر چووبوونە گوندی بەردەشان وە چیکەش نەقەوماوە ، . . . بەلام ئەوەش دوورنیە کە تالان کردنیش رووی دابی ، چونکە کورد هەتا لە سەدەی بیستەمیش یەکتر تالان دەکات پیاو پیاو دەکوژیت ، وە گوندو ئاوابیو خەرمانی یەکتر دەسوتینن ، گوانی مەرو مالاتی یەکتر دەبرن ، پاوان و دارستان تاگر تی بەردەدەن لەم دواییانەش شتی تریش فیربوونە بە دزیەوە بە ناوی نیشتمان پەروەری هەزاران بەکوشت دەچیت و کەس نازانی ئەوانە بوچی کوژران !

کورد هیشتاش لە دەوری پاشـــا گەردانیو دەرەبەگی دەژیت ، خیلەکانی کورد لە سەربـــەق هەرد سەدەها کەس بەکوشت دەدەن ئەوەش کەلی هوی هەیە نایێتە پی نووس بەلام خوا سەروکەکانمان بگریت ! کە تەنیا سامانیان درود دەلەسەو رووئاندنەوەی میللەتە ، هەر دەم ئاقمی وەك گورگ کورد رووت دەکەنەوە بو بەرژەوەندی پیری لە نوکەری بیگانە !

# بەیتی کیسەل

عەلی بەردەشانی وەکوو ووتمان لە سەر هەموو شتی بەیتی داناوە ، بەیتی کیسەل لە ( ٥٠٠ ) دیر زیاترە بەلام بە داخەوە لە کاتی خوی دا هەموویم نووسیبوو وەکە لە قەلادزە ماموستا بووم لە ناو تەنەکەیەك لەگەل گەلی شتی ترو دیوانی هەلبەستی خوم کە بەرهەمی ( ١٥ ) سالم بوو میری ( دەوری شای گور بەگور دەریان هیناو بردیان‌و لە سلیمانی سووتاندیان . . . )

بەلام ئیمە دەبی بپرسین هوی چیە کە عەلی بەردەشانی بەسەرکیسەل بەیتی هەلداوە ؟ ئایا بو پیکەنین‌و رابواردن بوە یان فەلسفەیەکی تایبەتی تیدایە ؟

بەلای منەوە بەیتی کیسەل یان چیروکی ( فس فس پالەوان ) یان ( ئەحە جولا چون بوو بە شا ) ، ئەو چیروك و بەیتانە وا ئەزانم بو گالتەو گەپو رابواردن دانەندراون بەلکوو هەریەکیکیان فەلسفەیەکی لەبارەی ژیانەوە تیدایە . .

لەکاتی خوی دا ( میخائیل سرفانتس ) نووسەری مەزنی ئیسپانی کە چیروکی ( دون کیشوت ) ی بلاو کردەوە خەلکەکە هەوەل جار بە ( فشـــقیات ) دایانە پی نووس لە پاشان بویان

دەرکەوت کە مەسەلە وانیەو ئەو چیروکە رەخنە یەکی زانایانە یە لە کار بە دەستانی ئەو دەمەی ئیسپانیا و دە ری دەخا کە خراپە لەناو نابریت بە چەکو بیرو باوەری کون .

لام وایە ئانیستیش ئیمە باش لە بەیت‌وقسە کانی عەلی حالی نەبووین ، لە ئایندە دا بومان دەر دەکەویت کە ( عەلی ) چەند بلیمەت‌و زانا بوە .

زور جار لە ناو کومە لی کوردە واری دا مروڤیکی پرو پووچو نە زان‌و بی غیرە ت دە بیتە سە ر کردە یە کی زور زل‌و خە لك کرنووشی بو دە بە ن هە روە کوو جاران بو بوت دە یان برد ، لە بەیتی کیسەل مەبەس ئەوەیە :

جورە کەسیك هە ن بی فەر ، ترسنوك و نە زان بە لام هە ل کەوت‌و روزگار لەبەر نەزانی‌و بەدبەختی میللەتی کورد دەیکا بە قارەمان‌و هەزاران کوردی دلیرو زاناو نیشتمان‌پەروەر لەبەردەمیا بەزەبوونی و کەساسی رای دەبویرن .

«» «» «»

خالق هە ر ئەتوی بو خو
کولە سە م کرد بە پە مو
هات ئاوی لی نیم بو خو
کیسەل لیی کرتبووم جو
ووتم کیسەل هەستە برو

ئێره نیه جێگه‌ی تۆ
کیسه‌ل له جوگا هاته ده‌ر
ده‌ی هاویشته‌ی پله‌نده‌ر
رام کردی ده‌سته‌و خه‌نجه‌ر
خه‌نجه‌ریکم دا له سه‌ر
نه‌ی ده‌بری وه‌ك ئاروی ته‌ر

خه‌نجه‌رم نابری به‌نی
ده‌کیسه‌لیم وه‌ژه‌نی
کیسه‌ل پیم پی ده‌که‌نی

هات کیسه‌لی که‌ناوی
له دوور را تفه‌نگان داوی
هه‌وه‌سی ده‌چته ماستاوی

هات کیسه‌لی ( بوکریسکان )
تفه‌نگ له شان ده‌بریسکان
بردی تالاتی کیسکان

« » « » « »

شه‌ویك چووم له ناوه
دووشه‌و چووم له ناوه
له خشپه‌یم چوو زراوه
هه‌لانم نو شه‌قاوه

هه‌ر چه‌ند ئاورم ده‌داوه

کیسه‌لم هه‌ر به‌دواوه

چا ئه‌ی که‌لی کورد خوت بیر بکه‌وه‌و بزانه چه‌نده‌ها کیسه‌لو فسوس‌و پروپوچ‌و خویری له کوردستانی به‌ش خوراو دا بونه‌ته شیرو پلینگ وه سه‌دان مروڤی زاناو قاره‌مانیش به مات‌و داماوی ژیانی خویان ده‌به‌نه سه‌ر . . . چا عه‌لی دروی نه‌کردوه حه‌قی بوه ئه‌گه‌ر له به‌ر کیسه‌لیش هه‌لاتبی ! هه‌روه‌کو ئیمه له به‌ر کیسه‌لانی سه‌ده‌ی بیسته‌م خومان کوتاوه‌ته کونجی به‌غدا !



# بەیتی شایی جندووکان (۱)

لە پارەی ( عەلی ) گەلی شت کوتراوە ، هەتا گەلی ئەفسانەو شتی روو نەدراو خراوەتە پالی بەلام لی کولینەوە لە شتانە کەم نووسراوە چونکە ماوە نەبوە نەك لە هەلبەستەکانی وورد ببینەوە بەلکە خوێندەوارەکانمان بایەخیان بەو چەشنە شایەرە میللیانە نەداوەو هەلبەستەو بەیتەکانیان کونەکردوتەوە بەلکە پیار کوشتنو پارەو کورسیان لە لا لە هەموو شت بە نرختر، تاروژی ئیمروش . . .

عەلی بویژیکی ساکار بوە بەلام زور بە ناو بانگ بوو حەتا حاجی قادری کویش ناوی دەبات :

دوو عەلی شاعیرن وەکوو حەسان
بە ردە شانو هەریرە مەسکەنیان

---

جا خەلك دەلین هەتا پەیوەندی لە گەل ئەجندانیش هەبو بویە بەندو بەیتی بو هاتوە ، بەلام ئایا ئەوە راستە ؟ بەلای منەوە شتی وا رەبو نادات‌و رووی نەداوە چونکە جندوکە و دیوو درنج

(۱) جندوکە ، لە مە چیتر ، ئە جندە ، جنوکە هەموری پی دەلین .

خویان شتی ئەفسانەیین چیکە نین جا کەوایە بوچی عەلی لە سەر شایی جنوکان بەیتی روتومو مروف والی دەکات کە باور بکات ئەو جورە شتە هەیە ؟

( عەلی ) خاوەنی خەیالو لی کولینەوەیەکی قوول بوە چونکە لەراستیش هەموو بویژیك زیاتر هەلبەستەکانی لە بنکەی خەیالەوە دەردەچی بویەش هەلبەست بایەخی هەیە ، دیسان لە کتیبە ئاینیەکانیش ناوی جندوکە زور جار باس کراوە وادیارە چوتە میشکیەوە .

ئەوە لەلایی لەلایەکی تریشەوە ئەفسانەی دیوو درنجو پەری لە هەموو ویژەکانی جیهان داهەیە بەتایبەتی لە ئەفسانەو چیروکەکانی کوردی .

. « هومیروس » کە گەورە ترین بویژی یونانیەکانی کونە کە ( الیازەو ئردیسە ) ی هونەوتەوە سەدەها باسی لە بابەت دیوو پالەوانانی ئەفسانەیی و سیحرو جادوگەری کردوە لە هەلبەستەکانیدا چەندە ها چەشنە یەزدانی باس کردوە .

خو فیردەوسی باوکی شاعیرانی فارس لەبابەت دیوو درنجو عفریتو جادوو شتی ئەفسانەیی دەستی لە هەموو بویژەکان سەندوە زور ترین بەشی کتیبە بە نرخەکەی « شاهنامە » پرە لەو چەشنە باسانە کە هیچ بیرو هوشیك قبولی ناکات .

جالیرەش دا عەلی ئیمەش لە سەر پەیرەوی ئەو شایەرو

بویژانەی میللەتانی تر ئوپەریتێکی ئەواوی لەسەر چنوکە دانراو. یەك جار بەنرخو جوانە ، لەبەر ئەوەی کە هەلبەستەکەی زور ریك و پیك و جوانە بویە چوتە ناو میشکی خەلکەوە ، چونکە گەلی میللەتی کورد زور سادەن تا ئیستیش چوار بەشی میللەتی کوردو کوردستان بروایان بە سیحرو جادوو دعاو شەوەو شەیتان میردە جمەو شەو لەیان هەیە ،هەر لەمندالیەوە میشکی منالانیان بەو باسە پروپوچانە پر دەکەن .

زوریش دەلین کە عەلی ماوە یەك نەقی بوە ، خەلکی ساکاری ئیمە شتی راستە قینە ناچیتە میشکیانەوە بە چەشنی شتی قورو بی بایەخ ، زور جار دەبیسین کە یەکی نەخوش دەکەویت دەلین : فلان لەمە چیتر دەستی لی وەشاندوە بویە دەمی خوار بوە یان قاچی گوجە یان خواردەروات ، دەلین چندوکەش درو جوورن بەشیکیان « صالحن » باشن بە شی دوەمیان کردەوەیان بەس خراپە پیشەیانەوە دەست لە خەلك دەوەشینن ، چندوکەش دەتانن لە هەموو جیکە حــازر بن ، بەهەموو شیوە یەك خویان دەکورن ، دەچنە بن عەرد . . . هەموو بەرهەمیــکی میللی فولکلوری پرە لەو چەشنە شتانە . . . هەموو ویژە یەك شتی وا خەیالی تیدا هەیە ، گەرچی گەلی هەلبەستو چیروك هەیە لەسەر شیوەی ئەفسانە بەلام پرە لە پەندو بیژەو شتی بە ســوود کە مروڤایەتی تا ماوە سوودی لی وەردەگریت .

زور شتیش تا ماوەیەکی زور بە ئەفسانە خراوەتە پیش چاو کەچی وا نیە ، زانست پیشانی داوە کە شتە کە راستە تینەیە ، زور کەس لە ئیمە قەلای « جورندی » بە ئەفسانە دەزانیت کەچی خوم بە چاوی خوم ئەو قەلایەم دیت ، چەرخو نەلەك کە لە ئەفسانەی کوردی دازور باسی کراوە وا ئیستی ناوی فروکەیە دوور نیە کە هەبوو بیت .

خەلك وایان دەزانی شووره ی چین ، اهرام ، منارەی اسکندر چیروك ئەبی چیکە نین کەچی پاش پەیوەندی پەیدا کردن و سەنەری خەلکەکان بو ناوچەکانی ئەو شوینانە هەمووی راست دەر چوو ، منارەی جونبان لە اصفهان ، جەمامی کە بەیەك « موم دەسوتی » وا دەدریایە پی نووس کە ئەفسانەیە بەلام من خوم ئەو شتانەم بە چاو دی . . . بە کورتی زور لە ئەفسانەش هەیە کە راستە زور شتی واهە بوە ئیستی ناوی بەشتی تر گوراوە لەوانە « جامی جەم » کە ئیستی ناوی « رادارە » . . .
. . . . و . . . . و . . . .

جا بابینەوە سەر باسی شایی جندووکان وە کوو خەلك لە کوردستان دا لە زاری عەلی دەیگیرنەوە . .

« » « » « »

شەویك لە شەوان خیلی لە خیلە کەورەکان جندووکە شایی و لغانیان دەبی ، میرەکەیان جندوکە یەك دەنیری بەدوای

عەلی بەردەشانی بوبەش داربوون و عەل سوراندنی ئەو شایەر
سەر چوپی کرتنو بەندو شیعر ووتن ، چونکە لە کوردستان دا
تا روژی ئەو روونش هەر شایەیەك بسووریت چە رەش بەلەك
چە جوریکی تر باوە دەبی پیاویك شایەر بی یان مقام بیژدەبی
هەلبەستی شابی بلیت یەکیکی تریان هەندی کەس بوی بکیرنەوە
جندووکەکە لە دەرگای مالی عەلی دەدات عەلیش دینە
دەرەوەو لیی دەپرسیت : کییت ؟
جندووکە کە ناوی خوی پی نالیت ، چونکە دەلین :
جندووکە ناوی خویان بو کەس ئاشکرا ناکەن چونکە وەکوو
حیزبی نهینین !
عەلی گومان لە کابرای جندووکە پەیدا دەکاتو پی ی
دەلیت :« من کە نەت ناسمو نەزانم بوچی هاتوی چون قسەت
لەگەل بکەم ؟ »
جندووکە دەلیت : « من بویە هاتووم تا بەم بو سەر
پەرشق کردنی شایی خیلی ئیمە ! »
عەلی دە لیت : « تکایە ناوو ئیشی خوتم پی بلی هەتا
لەگەلت بیم »
بەلام جندووکەکە زور شەیتان دەبیت بەزبانە لووسەکەی
عەلی هەل دەفریوینی ، جا خوی دە گوریت لەگەلیا دەکەویتە
ریگا ، ماوە یەك پیکەوە دەرون عەلی لیی دەپرسیت :« تو کییت

پیم نالێی بۆچی هەر لە پیشمەوە دە رویت دەبێ ئەو ماستە
موویەکی تیدا بێت ، وادیارە پیاو خراپێ یان دێوو درنج و
جندووکەیت . ! »

کابرای جندووکە ناچار دەبێ کە پێ لە راستی بنێت بۆیە
لەوەلام دا دەڵێ :

« راست دەکەیت من جندووکەم ، پاشا کەمان منی ناردوە
بەدوای تو دا بت بەم بو سەر شایی و سەرپەرشتی کردنی ئەو
ئاهەنگەی سازمان کردوە بو ژن هینانی کوری پاشای خومان
لەبەر ئەوەی توش شـایەریکی بە ناو بانگیت بویی ئەو بەزمو
زەماوەندە بە هوی تووە بەرەونەق ترو کەشە دار تر دەبێ . . »

« » « » « »

جا عەلی بەجندووکەکە دەڵیت :

« باشە ئەو کارە چون دەگونجیت من ئـادەمیزادو ئیوەش
جندووکە ؟ دەترسم دەستم لی بوەشینن ! »

کابرای جندووکە دەڵیت :

« سویندت بو دەخوم بەسەری شاکەی خومان کە هیچت
بەسەر نەییت ، ئەوەش بزانە ئیمە وەکوو ئیـوە ئادەمیزاد
دروزنو خائنو فرونیل چیو دزو کەلەکچی نین ، بویە سویندو
پەیمانمان قەت درو دەرناچیت ، ئەوە لەلایی لە لایی تریشەوە
بو شادمانی تو ژنیکم هەیە جوانە و ژن خوشـکیکیشم هەیە

وەکوو ڕۆژی ڕوناك وایە لە هەر دووکیان سەر پشك بە کامیانت بویت دەت دەمی ! »

عەلی کە باسی ژنی بو دەکات دەلیت :

« کەواتە واریك کە وتین . . . هە ر لە ئیستاوە ژن خوشکەکەتم دەویت ! ! ئەگەر ژنە جندووکە یە کیشم هە بیت خەنی دەبم . . »

هەردووکیان پاش ئەو مامەلەتە بە شادمانی ملی ڕیگایان گرتەوە ، پاش ماوە یەك دیسان عەلی لە جندووکەی پرسی :

« ئەری برام عە یب نە بی ناوی جـــە نـابت چیە ؟ » جندووکە : « نـاوی ڕاستیم کەتی یە ! » عەلی : « بەلام تو دەزانیت کەتی لەبەندو هەلبەستە کاندا باش بوم جوور نـابیت بەوریك و پیکی ، وە قافیە کانم لاسەنگ دەبن وامن ناوت دەنیم قولەشین چونکە جلەکانت شینن . . »

قولەشین : « زور باشە هەرچی بلیی من ڕازیم . . »

« » « » « »

زور ڕرویشتن یان کە م تا وە کوو کە یشتنە هەوارگەی جندان وە چوونە لای شاییەکە جا عەلی لیی پرسی :

« قولەشین کامەیە ژن خوشکەکە تە ؟ » قولەشین :

« ئەو دوو ئافرەتەی دەستی یەکتریان گرتوە یەکەمیان

ژنەکەمەو ئەوی کە شیان نسکیی ژن خوشکمە ، ژنەکەم نـاوی « بسکی » یە . . . »

لە پاشان قولەشین بە خەلکەکە دەلیت :

« ئەوە عەلی بەردەشانیە بەلام بە مەرجی هینـاومە کە نسکیی ژن خوشکمی بدەمی ! »

چندەکان بەو مامەلەتە رازی نابن و دەلـین : « ئەگەر ژنەکەی خوتی دەدەیتی ئەوا باشە دەنا ئیمە ناهیلین ئەوە بکەیتو نسکیی بدەیتی چونکە جوانیو ناو بانگی خیلەکەی ئیمـە بە نسکی وەیە »

جا قولەشین دەگەل خوی دەلیت :

« با بە ندیك بهاویمە عـەلی و رازی دلی خومی بو دەر برم » .

قولە شین :

لەگەل تومە عەلیە شـورە
دل لە جیرانان مەگورە
ئەو رو راوەو راوە پورە
« نسکی» بە « بسکی» وەگورە
ئەوەی کچە جوان و تورە
مەرجی ژنە زولف شورە

« » « » « »

جامه یزی مــــه یزی هه ریار
عه‌شقی جه‌فات بم وه‌ره یسار
بوت نه‌مابووم « بسکی » نازدار

. وه‌لامی هه‌لی :

به و خالقه ی بـــــه حه واوه
په‌نجه‌م له ناو په نجه ی ناوه
عه رزو ئاســــمانی داناوه
هه روا ده بێ بـــــووك زاوه
ده لیی حه وســــه دم پیداوه
نیسکی نه بهم ناچمه دواوه

قواله شین :

کاکه ، کاکه ، برا ، برا
سه‌ر سونه ی که ردن کوتره
بو مه‌سله‌حه ت گوێ راکره
چونکه مه سله حه ت چاتره
« نسکی » بەردەو « بسکی »بکره
له کونی باس قه لنه‌ی ته نگتره

هه‌ندێ ده‌لێن :

له کونی زه نگیانه ی ته‌نگ تره

وه‌لامی هه‌لی :

قولەشینەی بەلـــەك چـاوی
دەلبی کـەری قاپ شکاوی
لە خەراتان (١) بە جیمـاوی
کلکم گرتووی پەزکم نـاوی
لەسەر وەعدی خوت ناپیاوی

« « «

سەك باب مەکە لەوە لەوێ
حیزب باب مەکە لەوە لەوێ
دەت کەم بە مایێ نیو رەوێ
کات بو دادە نیم بو شـــەوێ
هیندەت دەکیم ناو کت کەوێ !

قوله شین :

خزمە خراپم لێ قـــەومـاوە
ئەو ســـەکە هاتوە لەو لاوە
ملی وەك رەشـــە پیتـاوە
شایی لە نیمـــە تیك داوە
عەلی !

تو بەو ئەپلەی کویێ شورتەوە
من بەفەقیانەی پـــــپورمەوە

---

(١) خەرات ـ دوم

چون«ئسکی» بە «بسکی»دە گورمەوە

«» «» «»

« ئسکی » کچەو « بسکی » ژنە
ئەو هەلالەو ئەو سووسـنە
ئەو بیستانەو ئەو هەرزنە
حیزباب چەندت رق لە منە
بو رایەکەت بەو دوو گونە

قولەشین :

بە ئەم بەرو بە ئەو بەرێ
بە چاکی «مەرگە» و «پشدەرێ»
لە شانامەی یا لە پەروەرێ
ژنەکەت دەکێم چاوت دەرێ !

عەلی :

داکت بینە جێی داکم
ئەنکت بینە جێی ئەنکم
کیرت توند کە لە ناوکم
بورایەکەت بەسێ لکم
حیزباب چەندت لێ بەرقم
وەك سەرچاوەی بوت دەتەقم
ئەو بورایەت بەمەترەقم ! !

« قوله شین » بوی دەردەکەوێ کە ئەو دەمەتەقەیە لەگەل « عەلی » بێ هوودەیەو دەرەقەتی نایەت وە عەلیش لە کەری شەیتان نایەتەخوارەوە بویە ئەوە بەندە دەلیت :

سەرم تورەکەی توتنی
کون کونم کەن بە سووژنی
وورد ووردم کەن وەك عەرزنی
عەلی « بسکیت » قەت نادەنی

عەلی :

سەرم تورەکەی بزماران
لیم دەن بە کویخاو سەرکاران
دەست هەلناگرم لە یاران
سوورە گولەکەی باغی جاران
جا بە مەیزی هەریاران
سوورە گولسوور بوونلە باغان

« » « » « »

وەرە بەم لاوە « نسکی » گیانە
با من ماچ کەم ئەو گولانە
مەم کە بە تانەی چندانە

« » « » « »

کاتێ « نسکی » لە شایە کە دا دیتە دەستیەوە ماچیکی

چون«ئسکی» بە «بسکی»دە گوزمەوە

« » « » « »

« ئسکی » کچەو « بسکی » ژنە
ئەو هەلالەو ئەو سووسـنە
ئەو بیسـتانەو ئەو هەرزنە
حیز باب چە ندت رق لە منە
بو رایەکەت بەو دوو گونە

قولە شین :

بە ئەم بەرو بە ئەو بـسە رێ
بە چاکی «مەرگە» و «پشدەرێ»
لە شانامەی یا لە پەروەرێ
ژنەکەت دەکیم چاوت دەرێ !

عەلی :

داکت بونە جێی داکم
ئەنکت بینە جێی ئەنکم
کیرت توند کە لە ناوکم
بورایەکەت بە سێ لکم
حیزباب چەندت لێ بەرقم
وەك سەرچاوەی بوت دەتەقم
ئەو بورایەت بە مەترەقم ! !

« قوله شین » بوی دەردەکەوێ کە ئەو دەمە نەقەیە
لەگەڵ « عەلي » بی هوودەیەو دەرەقەتی نایەت وەعەلیش لە
کەری شەیتان نایەتەخوارەوە بویە ئەوە بەندە دەلیت :

سەرم تورەکەی توتنی
کون کونم کەن بە سووژنی
وورد ووردم کەن وەك عەرزنی
عەلی « بسکیت » قەت نادەنی

عەلی :

سەرم تورەکەی بزماران
لیم دەن بە کوپخاو سەرکاران
دەست هەلناگرم لە یاران
سوورە گولەکەی باغی جاران
جا بە مەیزی هەریاران
سوورە گول سوور بوون لە باغان

« » « » « »

وەرە بەم لاوە « نسکی » گیانە
با من ماچ کەم ئەو گولمانە
مەم کە بەتانەی جندانە

« » « » « »

کاتێ « نسکی » لە شایە کە دا دیتە دەستیەوە ماچیکی

دەکات ، قوالە شین کە چاوی بەو کردەوە دە کەویت رادەکان بو لای سەردارەکەیان وپی‌ی دەلیت :

( پاشام خوش بێ عەلی بەردەشـــانیم لێ بەرەللا بوە ، ئابرووی بردوومو لە ناو شابی دا نسکیی هاچ کرد ! )

پاشاش فەرمان دەدات کە عەلی بانگ بکەن ، عەلیـش دەچێتە کن پادشای جنوکان ئەویش لیی دەپرسیت :

( عەلي ئەوە چیتە لەگەل قوالە شین ؟ ) عەلی دەلیت :

( سەروەرم قوالە شین هات بە دوام کـــە بیم بو ئەو ئاهەنگە کە خیلەکەتان سازی کردوە بەو مەرجەی کە ( نسکی)ی ژن خوشکیم بداتی . کەچی واشیـق لە و بەلینەی خوی پەشیمان بوتەوە )

پاشاش بەعەلی دەلیت :

( باشە من نسکیت دەدەمی بەمەرجیك لە گەل قوالە شین بکەونە شەرە شیعر بزانم کامتان دەبەزن )

لیرە دا جاریکی تریش ( عەلي ) پەنا دەباتەوە بەرخەیال بەلام ناتوانی هەلبەست بلیت . . . لەسەر ئەوەشەوە بەمەرجەکەی پادشای جندووکان رازی دەبیت :

( باشە باوکم وەرنە مەیدان بسم الله الرحمن الرحیم ..! کەناوی ( بسم الله ) لەدەمی دیتە دەرەوە جندووکەکان

وون دەبن لە پێـــش چاوی کـاتی خوی دەبینێتەوە ئەوا لە جێگەیەکی چۆلو هول فریێـــان داوە ، لە دوورەوەش لە سەر لوتکەی شاخێك قولە شین راوەستاوە دیتو بەعەلی دەلیت :

( خوابت گرێ ئەو شاییە خوشـــەڵ بو واتێك دا ؟ )

عەلی دەلیت :

( واللە بلیم چی باوکم ئامادەم شاییەکەی جاران ساز بکەمەوە پیرەژنیکیشم بدەنی رازیم ! )

قولە شین :

( باشە وەرە بونی ئەو گولە جوانە بکە دیسان شاییەکەی جاران خو بە خو ساز دەبیتەوە ! )

( عەلی ) بەفریو دەچیت وەگولە کە بون دەکات ، هەر دوو چاوی کویر دەبی ، زور لە قولە شین دەپاریتەوە کە چاکی بکاتەوە بەلام هیچ داد نادا قولە شین پیی دەلیت :

( زور موستەحەقی کویر بوونیت زورم پێ ووتی بەلام بەقسەت نەکردم . . . )

عەلی :

( باشە وەکوو کویریشت کردووم بم بەوە نزیــــك مالی ( عەنبەر ) هەر چونێك بێ ئەو بەخیوم دەکات ! )

قولە شین سەریکی دار عەساکەی دا بەدەست عەلیو پیی

ووت : ( دوام گەوە . . . )

عەلیش بە ناچاری‌و بەکویرە کویرە بە دوای قولە شین کەوتو بردی لە چیای ( دەروو ) لە ( کاویك ) (١) ی هاویشت ! وە پیشی گوت : [ دە زانیت ئیستی تو لە کویت و ئیرە کی‌یە ؟ )

عەلی : « نەخیر نازانم . . . »

قولە شین :

ئەو کاوە کاوی « لوتەر » ی یە ئەگەر بەر ببیەوە پارچە پارچە دەبی ! »

عەلی بەو کویریە دوش داماو قولە شین بە جیی هیشت وەگەرایەوە ناو خیلەکەی . . .

کاتی چندوکەکان هەوالی عەلیان لە قولە شین پرسیار کرد ، بەسەر هاتەکەی بو گیرانەوە کەچی بە سەر عەلی بە منە زبان هیناوە . « نسکی » و « بسکی » کوییان لە قسە کانی قولە شین بوو رایان کرد بولای دایکیان‌و بەسەر هاتەکەی عەلیان بو گیرایەوە ، دایکیان پی‌ی ووتن :

« دەبی بچن نان‌و ئاوی بو ببەن ، گولیك لە ئەشکەوتی ئەو شاخەش دا هەیە کە عەلی تیدا حاسی بوە بیدەنی بونی

(١) دەشتایەکی بچووك هەرچواردەوری لوتکە شاخی بەرز،

بكات چاوەكانی چاك دەبنەوە ! » .

بەو چەشنەی كە دایكیان پێی وتبوون نانو ئاوو گولە كەیان بو عەلی برد وە لە دوورە وە بویان فڕێ داو پێ یان ووت : « گولە كە بون بكە » .

كاتێ « عەلي » گولە كەی بون كرد چاوی چاك بووە وە و پیشینیان ووتبوو : « داركەر بەزوری دینە ئەو ناوە بانگیان بكە دەرت دەهێنن » .

عەلی بە دەنگێكی بەرز ئەو هەلبەستەی دەووت :

« پیر مەمەندی » « مەمەنداوێ »
چاكە چكولەی لە « خوشـاوێ »
خوایە راو كەر بینـە راوێ
عـەلی دەر بێنن لە كاوێ

« » « » « »

رەبی دار كەر بێنە داران
عەلی دەرینن لە مغاران
بیكەنە وە بە شاعیری جاران

« » « » « »

كاتێك هەندی راوكەر دینە ئەو ناو چەیە بو دار كردن گوییان لە بانگی « عەلي » دەبیت ، بەشوین دەنگەیە وە دە چن

وە دەری دەهێنن ، لیی دەپرسن ! « ئەوە چی ئوی کە پاندبوو ئەو جێگا سەختە ؟ » .

عەلی باسەکەیان بو دەگێڕێتـــەوە بە دوورو درێژی بەلام دارکەرەکان بڕوای پێ ناکەن ، عەلیش بو دل نیایی‌و بتمانی پێ کردنی ئەو رووداوە چەند بەلگە یەك دەهێنی‌و دەلیت :

« بو راستی قسەکانم شەو کویرەکەی فلان مالیان هیناوەو کردوویانە بە بریانی ، کاتێ تیریان لێ خوارد رشانەوەو گوشت‌و ئێسقانەکانیان کو کردەوە بەلام ئێسقانی پەراسوو یەکی کەم بوو پارچەداریکیان داناپە شوینی وە سەر لەنوێ کویرەکەزیندووبووەو بردیانانەوە مالی خاوەنی ئەکەر بەمنیش باوە رناکەنو کویرە کـە کە بدینن راستی قسە کانم دەردەکەوێ بوتان »

ئەو پیاوەی کە ئەو باسە ی گوێ لێ بوە لە پێشینـان لە سەر باسەکەی رویشت‌و گوتی خـــەلکەکە چوون و کویرە کە کەیان لە کابرای کری‌و سەربان بری سەرەنجیان دا قسەکەی عەلی راست‌دەرچوو ئەو شوینەی کە ئەو شاییە ی لێ کراوە تـا روژی ئەو روش ماوەو لەوە ناوچەی مەرکە یە ناوی « گوری بووکی » یە ، گوریش بە ناوچەیەکی دەشتایی دەلین »

هەندیکی تریش دەلین :

« کە عەلی لە کیوە کە دیتە خوارەوە کە ناوی « کیوی

مەمەنداوی ) یەکە دەکەویتە ئاوچەی خیل « مەنگسور زور
تینووی دەبیت هەر دوو چاوی دەرپەرییوو دەچینە سەر کانیاویك
کە کیژوکار ئاوی لێ دەبەن ، هەندی ژنو کچ چاویان بە
هەلی دەکەوێت هەترەشیان لیی دەچیتو لە بەری هەل دین ،
کچ لیی دەپرسن : بوچی واهە بەسەر هاتوە ؟ لەوەلام دا دەلیت

سالەکی بووم لە مران (۱)
هیندم کسان کیژی دەمەنگوران
بویە هەرتك چساوم دابزگران

«» «» «»

هەندێ خەلکی تریش دەلین :

قولە شین لەگەل هەلی دەکەوتە دەمەتەقەو دەلیت :

لەو عەلیسەی کیسژو ویسژە
خو تسو نەت کسردوە نویژە
قسسەی لەزارتە مسەی بیژە

هەلی :

قولە شین گەلەك هسە لەوەری
زکت بوویتە پیسستەی مەری
هیشستان دوورم پیم دەوەری

«» «» «»

(۱) مر ـ شوان

عه لی سوار بوو له ماینی یه
ماین شـــارەزای بری یه
بەجێی هێشت دەشتی مەرگی یە

« » « » « »

یا خوا یا چاکی پەر مەنداوێ
ئەی یابەکری لە خوشاوێ
پیر مەسووری لە سەنگاوێ
ئەو رو راو کەر بینە راوێ
عه لی عــاسی بوه لە داوێ

« » « » « »

چەند کەسیك ووتویانە :

ئەو هەلبەستەی پاش ئەوە داناوە کە تووشی نەخوشی چاو بوە لە ئەنجام دا هە ر دوو چــاوی کویر دە بێت ، بو ئەوەی ناوی بویژی خوی لە دەست نەدات ، کویر بوونەکەی دەکاتە هوی ئەو بەسەر هاتەی جندووکان » بەلام خەلکی سادە دەلێن :

ئەو باسە راستەو عەلیش چوتە شایی جندووکان ، چونکە هەموو شایەریك جندووکەیەکی تایبەتی خوی هەیە (۱) کەفێری بەیت و هەلبەستی دەکات » .

(۱) هەندێ ئەفسانە دە لێت ـ هە موو بویژیك شەیتانیکی هەیە کە شیعری فێر دەکات .

بەلای منەوە بویە شق ئەفسانەو ئەفەو ماو دەخریتە پال کەسیك کـــە ئەو کە ســە کاریکـــی یەك جـــار بە رز بکات یان هونەر مەندیکی زور شارەزا ، یان قارەمانیکی وابێ کە کەم بەچاو بدیترێ لە ناو خیلەکەی . . . بویە هەلسان بە کاری بە « خارق العادة » زورە لە ویژەو فولکلوری کەلی میللەت وەکوو « زاباتا » ی مەکسیکی یان « روســتەمی فارســـەکان » ( عەنتەری عەرەب ) « دەویق ساســـونی » ئەرمەنیەکان . . .

عەلیش چونکە شایەریکی یەك جار هونەر مەندوو بەنـاو بوە خەلکی سادە وایان زانیوە دەتوانیت هەموو شتێ ئەنجام بدا هەتا دەگەل جنوکەش بکەویتە گفتوگو .

« » « » « »

ئەو چەشنە چیروکانە گەرچی بەلای هەندێ کەسەوە شق بێ بایەخن بەلام لەسەدەی بیستەم دا زور لەو شتـانە کراون بەفلیمو چیروکی شانوییی کە کەلێ جوانترن لە چیروکەکانی روو داوی ئەو سەدە بووینە زنجیرە فلیمەکانی ئیلیازەی هومیروس ، ئەفسانەکانی روستەم نامەو گەلێ چیروکی کونی تر .

# هەلبەستەکانی شاییو هەلپەرکێ

«» «» «»

هەلی سەدەها بەیتی هەیە کە بو شــــاییو هەل پەرکیو گورانی دەشیت ، هەموو شی پرن لە وەسفی کردکارو سروشت یارو تەدو بالاو ، چاوو رووەمەتو خەتو خال .

هەلبەستەکانی یەك جار پالراوو ریكو پیكو سادەن ووشەو ووتەی نەزاندراو بەکار نامینی چونکە بویژیکی بە تەواوی مبللی بوە بەزبانی سادەی کوردی بێ گری بەیتو هەلبەستەکانی لەدەم هاتونە دەر ، بی ئەوە پیان نووسیتەوە یان پیش تر ئامادەیان بکات . . .

هەلبەستو بەیتەکانی لە سەر زبانی جووتیــارو رەنجبەرو کریکار ریك خستوە ، بو چینی دەرەبەگو زوور دارو سەرمایەدار خوی ماندوو نەکردوە گەرچی گەلی هەلبەستی ناوی میرو پادشاو بەگی تیدایە ، بەلام ئەو کە ســـانەی ئەو روژە چونکە لە دژی زوور دارەکانی عوسمانی بوون بویە میژووی کورد بە ئە مربان

دادەنی (١) وەکوو بنەماڵەی بابانەکان لە سەروو یانەوە دوو پاڵەوانی کورد « ئاورەحمان پاشاو » وەسمان پاشا .

هەڵبەستی دلداریو شایىو هەڵپەرکێی عەلی ئەوەندە زورن کە بە چەند نامیلکەیە کیـــش دواییان نایەت ، بەلام بەیتو هەڵبەستەکانی بەپێی ناوچەو خێلو شارو دێی کوردستان دەگوریت کەلی هەڵبەستەکانی عەلی لەناوچەکانی هەولیرو کویەو دەشتی دزەییو خوشناوەتی بلاو بوتەوە جا بویە بەپێی جێگەو شیوەی ئەو ناوچانە گوێندەو مقام بێژو ساز ندەکان لەئاهەنگو شایى دا وشەو شیوەکانیان گوریوە گەرچی هەڵبەستەکانی عەلی بەشیوەی ناوچەی مەرگەیە کە « موکری » پێ دەڵین . . . لەناوچەی سلیمانیو پشدەر بەجوری تر هەڵبەستەکانی بلاو بوتەوە .

« » « » « »

شیوەی هەڵبەستی دلداری عەلی وا بە ناو کردوە « خازی » کە یاری بوە و دەڵین لە پاشان هێناویە بوتە سەرچاوە یەکی مەزن بو هەڵبەست و بەیتە رەنگینەکانی . . . هەر بویژەش یاریك پالی پێوە ناوە کە لە هونەری هەڵبەست دا بگاتە پلەی بەرزی . .

مصطفی بەگ قادر ناویك بوتە هوی ئیلهامی شیعری ئەو ،

(١) لنین ـ پشت گیری شای ئەفغانی دەکرد چونکە لە دژی ئیستعماری ئینگلیس بوو .

وەفایی «شیرین» کە کچی زۆر جوان بوە هەستی جولاندوە، یان ئەو شیرینە وای لێ کردوە کە ئەو شیعرە ناو دارانە دا بنێ .

«» «» «»

هەندێ بویژی کورد هەن کە بویژانی بیگانە بەتایبەتی حافظو سەعدیو (نظامی) ، قاءانی ، خەیام ، کلیمی هەمەدانی و . . . و کاریان کردوتە سەر شیوەی هەلبەستو بیری بویژیان بەلام عەلی لە سنووری میللی لای نەداوە بەلای منەوە دەبێ بویژ لە ناو جەرگەی کەلەکەی بژییت و ئیلهامی شیعری لەو دەشتو کیوو چیمەن و باخ و کیژی کوردو شایی ، باران ، سروشتی جوانی ناوچەی کوردستان وەربگرێ نەك بەدوای کوربێ بیری بیگانەو بالورەی ئەو لێ بداتەوە . . (١)

بەداخەوە هەلبەستەکانی شایی و هەلپەرکی کە ئەوانیش هەمووی هەلبەست و بەیتی دلدارین کە تمان کە وتوتە دەست وا لیرە دا چەند نمونە یەك بەناتەواوی بلاو دەکەینەوە هیوامان وایە لە دوا روژ خویندەوارانی کورد بومان تەواو بکەن .

«» «» «»

(١) هەندێ بویژ هاتوون هەلبەستی (نزار قەبانی) محمود دەرویشو (حسین مەردان) بە کوردی وەردەگیرنو بە ناوی هەلبەستی (تازە) بلاویان دەکەنەوە !

روژیك له رژوان سەر له سبیانێ
یارم راوەستا له زار هەیوانی
بەدوو چاوی رەش دەکا گریانێ
بە سینگی سپی دەکا کوتانێ
بوچی دەگریێی هی کیژە جوانێ
بابان و یرانی ؟

کچ :
چه کراسم نینه پی بکەم دیلانێ

« » « » « »

خومن بالدار نیم به بال بفرم
بچمه موسل و شام کراس بکرم

« » « » « »

دەچمه بەر بیـــلایی بێ
ئەو بیلاییمــــەم بە شـــینی
نـازدارەك دانیـــشتـــوە
بە پی ی لانکـــی دەژینی
لای لایەی بو کوری دەکوت
ناوی خوای لە کـــەل دینی
کوارەی چوار کوی لە کوی دا
ســـاغ لە زیری مار دینی

خەزیمەی لە لووتی دا
ئاگرەو ئامیـــدی دینی
ماچی ئەو زالم بابەی
زاخوو زیبار مزگینی

دەچمە بەر بیلایی بی
ئەو بیلایەم بلندە
ریشەی قەرە پۆشینی
دوو خالی رەش دەبن دا

ئەگەر تۆ یاری منی
نیشانەکی بە من دە
نیشانە چە نیشانە
قەنەفل و مەرجانە
تازەم بە دیاری بوهات
لە شاری کرماشانە

« » « » « »

بوت بکەم مەدحی یارێ
ئەو روش هە تا ئیوارێ
سێ روژان تەواوو نابێ
لە سبەی هە تا ئیوارێ

« » « » « »

عەلی بەیتیکی هەیە کە لە هەزار دیر زیاترە وەسفی یار دەکات زور بەوەستایی و هونەرمەندانە لەئەوتی سەرەوە تا نووکی پەنجەی پیدا دیت . . . هەر بەگەردانەی دورو لە عل وشەو چراغ دەچیت . . . هونەرمەندی ئەو بویژە لەپایەیەکی وا دایە کە ئەمری و تاو بانگی هەتا هەتایی بو بەجیماوە ، پایەی هونەری میللی کوردی گەیاندوتە ئەو پەری بەرزی .

ئەوانەی بە زبانیکی تر شتیان نووسیوە گەرچی شارەزان بەلام شتی ئەمر ئەوەیە کە بە زبانی کوردی نووسرابن یان لەبابەت کوردەوە بەزبانی بیگانە بنوسریّ کوسەوپوایتەکانی کورد کوردن بەزبانی خەلك دەنووسن گویا کوردی « باش نازانن » خوا بم گریّ وانیە بیگانە پەرستو خوفروشن !



# هەلبەستە میژوویەکانی عەلی بەردەشانی

وەکوو ووتمان عەلی لە سەردەمی حکومەتی بابانەکان ژیاوە ، لەو سەردەمەش دا وەکوو بومان دەرکەوتوە نـاوچەی کوردەواری لە بارێکی ئابووری باش دا ژیاوە ، هونەرمەندەکانی کورد هاتوونە مەیدان ، هەلبەستی میللی گەشەی سەندوە .

بەلام ئایا ئەمارەتی بابان هەر وهابە سەربەستی مـایەوە ؟ نەخێر دووبارە عوسمانیەکان روخانیان ، کاتی کە ماوەیان نەدەبو وە خەریکی چەتەگەری و شەر بوون دەگەڵ دەولەتی تەیسەر یـان ئیران . . . مـاوەیەك لە کوردستانی عیراق پشتیان دەکردەوە ، جا کوردیش لە هەندی شوێن کە مـاوەو فرسەتی دەزانی میرنووشینی بو خوی دورسـت دەکرد . . . وەکوو میرنووشینی « بابان » لە قەلاچولان و سلیمانی وە ( سوران ) لە هەریرو رەواندز دا

«» «» «»

جا وادیارە کە عەلی لەو سەردەمانە دا ژیاوە کە ناوچەی بەشی سلیمـانی لە کوردستانی عیراق دا بەدەستی حکومەتی

بابانەوە بوە . . (۱)

لەو کاتە ش دا دوو برا هەبوون کە یەکیان ناوی ( ئاورەحمان پاشا ) بوو « دوەمیان ناوی وەسمان پاشا دەبێ »

ئەگەر چاویك بە فولکلوری بەشی دوەم دا بخشێنی بوت دەردەکەوێ لە بەیتی ئاورەحمان پاشا زور بروای بە عەلی بوە وەهەتا دەگەل خوشی بردوویە بو ئاران .

جا ئیمە لیرە دا ئەو بەیتە دەنووسین کە بەسەر ئەو بنەماڵەی داهەڵداوە

« » « » « »

تاقو تەنیا هەر هەوە

باوكو پودەر پشتو ئەوە

کەدات دەنا ئابو هەوە

هەر باب ئادەمو داك حەوە

(۱) یەکێ لە صەروفە « بەرانەت دەرەکان و خولامی « السدة الملکیه » لە گوڤاریك دا نووسی بووی : کوردو یژەی نیەو هەرچی هەیەهەموو شتی هی دەرە بە گاپەنیە ، مام . . . . . سەرو کویلاکی ویژەی کوردی دەشکێنیو دەلیت کورد نە « مەلحمەی هەیەو نە چیروکی دریژ » ئەو چەشنە کە سانە باشتر ئەوەیە کە باسی شتی وانەکەن چونکە « نان بو نانەواو گوشت بو قەسابە ! »

ئاسمان لە سەری گرتەوە
کولی شێتێ زەوە زەوە
چە لە هەردی چە لە خەوە
فانی دەبێ ئابێتـــەوە

— ٢ —

فانی دەبێ بە یەك جاری
یاخوا و یا حەزرەتی باری
پێغەمبەرو هەر چوار یاری
قورئانیان هات بو بە دیاری
روژ بە روژ رەحمەت دەباری
تی ی خیر بێ بو منی هەژاری
دوو برا هەبوون خەلکی شاری
لە دەسیان دابوو سەرداری
ئێکی ماخوی سەد .هەزاری

— ٣ —

هەزار هەزار لە وان نەخشان
لالە رەنگن لە سەر فەرشان
شەوو روژی دەکەن پەخشان
بو حاکم و میرو چاوەشان

— ٤ —

میریکی بە کفت و گویە
هادە ربە ندو قورە کویە
مەرگە و بیتوین و ئاکویە
حە مە داغا بە شی نویە

— ٥ —

خاوە ن بە شی بەشت کەمە
میر دەفەرموێ نەت بێ خە مە
پیت راگیری ئە و زە م زە مە

— ٦ —

پیت راگیری زەمی ســـالی
بلباس و چیای کــــە لالی
حو کمی وەر گرت کەس نەنالی

— ٧ —

حو کمی وەرگرت زور بەوازی
هات بە یداخ و تەپل و بازی
کێ مەردە بە خوی بنازی
پاشا پی ی دە کا رەبازی

— ٨ —

سوار بوو یوســـفی ئە وە لی
مە تالی زیر لە کودە لی

سپه‌یی سه‌حه‌ر ئاو هه‌لی
ئه‌یرو قوش و باز ئیکه‌ لی

— ٩ —

ئه‌یرو قوش و بازان شه‌ره
سپێین پور به‌ش نه‌ره‌ئه‌ره
قر قرر ئه‌یریکی به‌د فه‌ره
له برنجاری ئیر ده له وه‌را
ئیکه‌ل ده‌بوون سوار ده‌که‌را

— ١٠ —

سوار ده‌که‌ران به‌ بێ وازی
به‌ته‌پل و لیدان ، ره‌مبازی
حه‌سره‌ت شه‌هینی کولوازی
لیی دابردی بو هه‌ورازی
شکاندی دوو بالی قازی

— ١١ —

به‌ڵێ له‌رم سواری سه‌کراوی
ران و رکێنی ده‌ستو ماوی
شه‌ق به‌ند و دانه‌ لغـــاوی
سوورن، ره‌شن، سپین، ماهی «ماوی»
ئی ده‌ره‌ش وه‌ك ئه‌له‌ مراوی

میر دەفەرموی « عەمرو چاوی »
« موبارەك بێ خوش بوو راوی »

— ۱۲ —

راوکەر وا لە بن سنووری
وەك موسی لە سەر کیوی تووری
شاد دەبوو بە مەقام و نووری
ئیمەش واین بو شارە زووری

— ۱۳ —

شارەزوور خوش شارە زوورە
کەیخو سرەوی دیوان گیرە
« رەحمن پاشا » بو خوی میرە
ســەد هەزارانی لە بیرە

— ۱٤ —

لە بیریە لە زور تاکەمی
میر چوە راوە پوری چەمی

— ۱۵ —

میر چوە راوێ نەگە راوە
لە خاك و خولی بەم لاوە
هەر لە کچکە هەتا ساوە
عبد الرحمن پاشا سەر راوە

له دووره‌وه ده‌ی دین شاوه

— ١٦ —

شاوه‌ی ده‌ دین به‌ موشـــته‌ ری
ئه‌پل و قه‌مچی و تاژه‌ نـــده‌ ری
ئه‌ که‌ راوه‌ گه‌ یپه‌ ســـه‌ ری
ئاکو توو کیان لیَ هه‌ لفری

— ١٧ —

دیار ده‌ غولامی راو که‌ رانم
شا زولفی سه‌ر که‌مبه‌رانم (١)

— ١٨ —

شا زولفی میناى بیَ که‌ ردی
ئه‌وجه‌ وانان راو له‌ کردی
راو دابه‌ شکرا له‌ بن گردی
قوته‌ قوته‌ لاجی ویـــردی
خیزره‌و بـــیزره‌ تاژیان بردی
پینج سه‌د ساموته‌م لیَ ژماردی

(١) لیره‌ دا وه‌کوو خوینده‌وار ده‌ بینیَ هه‌ ندی به‌ ندی ئه‌و به‌یته‌ که‌مه‌ ، چونکه‌ له‌ دوو به‌ یته‌ وه‌ تیایه‌ تی تا شه‌ش به‌ یتی « دیر » وادیاره‌ به‌ نده‌ کان که‌م و کوورییان زور تیدایه‌ له‌ بیر خه‌لك چوته‌وه‌ .

به گ لەران به زیافەت خواردی

— ١٩ —

راو کەران هەر راوە راوە
سی سەد ئەسپی بە لغاوە
رەحمن پاشا خوی سەرراوە

— ٢٠ —

راو بە تال بو پاش نیوەروی
دابەش کرا لە « خرە جوی » (١)
پاشا کەیبە قورە کوی (٢)
میر دە فە رموێ دە چمە کوی

— ٢١ —

پاشام واهات بە میوانی
بو لای میری دەسورانی
کورە کورە ی دە کوییانی
کوریە و کالە ی فە قی یانی
رانك و چوغە و چە مە دانی

(١) خرەجو - گوندیکە لە تەنشت سەنگە سەر .

(٢) قورەکو : دییە کە لە مابەینی دەربەندی سەنگە سەرو رانیە ئیستە بەژیر ئاوی دوکان کەوتوە .

سمیل سووری سنه‌یسانی
هه‌مووی جانی بۆی جسانی
هه‌مووی خانی بۆی خانی
ده‌سته‌ی حه‌سه‌ن خه‌له‌کانی
دوله و یاپراغ و بریانی
پلاوو گوشت و شیلانی
تیسقه و قالیسقه و ده‌رمانی
خورده‌و برده که‌س نای زانی
تیی بر ناکا به‌رده‌شانی

— ۲۲ —

به‌رده‌شانی به‌غولامی تو
وه‌باوو ملك‌و باجی تو
راوه‌ستاون به ئه‌مری تو
وه‌سه‌ر فتره‌و خه‌راجی تو

— ۲۳ —

سه‌راج و مه‌یته‌ر ناردن
عه‌بدی کویله‌ن وه‌ك شاترن
ئه‌مینن تیده فکرن

دبن محەندەکان دەکرن

— ٢٤ —

محەندەك دەکەن پێکوانن
رەختەو ریشمەی وەك سەھولن
زینی قەدیفەی لە کوانن
ووھا چاکە وەك میر دەلن

— ٢٥ —

سەفەری میری موطلەقە
چەرمو قایش و میشن و شەقە
ھەموویان برین بە میزو باقە
بە یانی ھەستن شەقەقە
نال بە ندان ھەر شەقە شەقە

— ٢٦ —

شەقە شەقی نالبەندو بە قالان
وەکویان کرد بە حەمبالان
بەعەیێ بیست و دوو سالان
« پاشام » بردی وابە تالان

« » « » « »

ده‌این ئه‌و به‌یته‌ چه‌ند ماڵێك ده‌وامی کردوه‌ چونکه‌
عبد الرحمن پاشا چو بو تاران بو ئه‌وه‌ ده‌گه‌ل شای ئیران
ریك بکه‌وی وله‌ وی یارمه‌تی بده‌نی که‌ ده‌گه‌ل عوسمانیه‌کان
شه‌ر بکات به‌لام عه‌جه‌مه‌کان درویان له‌گه‌ل کرد . . . ئه‌و
له‌شکره‌ی دایانی له‌به‌که‌م شه‌ر دا له‌کن هه‌ولیر رایان کردو
پشتی کوردیان به‌ردا « تکایه‌ فولکلوری به‌شی دوه‌م بخوینه‌وه‌
به‌ناوی به‌یتی ناو ره‌حمان پاشا » .

ئه‌و به‌یته‌ یه‌ك چار زوره‌ داخه‌که‌م هه‌ر ئه‌وه‌نده‌مان
به‌ده‌ست که‌وتوه‌ ـ ئه‌گه‌ر کاك احمد ئاکو نه‌بوایه‌ ئه‌وه‌نده‌شمان
بو کو نه‌ده‌کرایه‌وه‌ زور سوپاسی ده‌که‌ین .

« » « » « »



« ١ »

# فرهەنگی عەلی بەردەشانی

« » « » « »

ڕوو دەچم : دەچمە خوارەوە

کوچی کوچی : وشەیەکە بو بانگ کردنی سەگ بەکار دیت .

هەلیك مەلیك : « بەفرو فیل - ڕەوشت خراپ »

سی پیك : یو مشکە هەژاندن بەکاری دەهینن پی دەاین سێ کوچك بومەنجەل .

توری : « خویری » .

جەلەب : کومەل . بە میکەلەمەریش دەاین .

خاس : باش . هونەرمەند شارەزا .

دیلان : شایی . زەماوەند « دیلانە - گورانی »

زەردەی دەهاتنێ : زەردەخەنەی دەهاتی .

خوناو : ئاوەنگ . شەونم .

کالەکال : هەراو هوریا . قیرە قیر . چەقە چەق .

ئاوەژێ : لەپشتەوە . بەرە واژوو .

بەوازم : بەئالوکەم .

چەنکەرن : یەکتر دانە بەر چرنووك .

خوخماخلی : لیدان بەپشوو دان . شلو کوت کردن .

فەلە : تەیاری . اسوری .

رادەسا : دادرسا « هاتنەویزە »

بلح : خویری . هیچو پووچ . خراپ

چەکەن : چورە گیایەکە حەسیری لێ دورست دەکەن

بەربەن : گەردانە « گەردەنە »

لیس : تیلا . کوتەك

قوومار : کەمە . یاری کالتە . وازی

خو بەسەر : بەتەنیا . هەر ئامانجی خوی دەوێ

قولاغان : لاو . جحیل . گەنج . دەمرووت

وەجاغ : خانەدان . نەوە . وەجاغ زادە خاوەنی وجاغ قاوە بەخشی - واتە پیاوی مەزن .

سوراغ : پرسیار کردن لە جیکە وشوینی کەسێك یان جیکە یەك .

بە فەروفیك : بەپیتو بەرەکەت .

لینی : لیینی . لێ یەتی . بو جەمعە

چور : قومیك ئاو

هەل پەتیو : نەمام . شیخەل

دەوەن : ئەراش . داری چکولە .

موکاره : جوریکه له چەکوچ بو هەل کولین بەکار دیت
چەقەن : جیکەی بەردەلان . یان جیکەیی بەرز لە سەر
لونکەی شاخیك .
پوله : لەچك . قوته
شیلانه : جووره خشایکی ژنه
تەحا : ووشەیەکە بو سەرسورمان بەکار دیت .
گوی لار : گویٚ شور
له ئاقار : بەرامبەر
شوری : شور . شوره ؛ یار . جوان . شەنك
سوار : یەتی سوار چاك
سونه : مراوی .
خەرات : دوم . کاولی
رەزگم ناوی : لەزگم ناوی یەنی کاری خراپ کردن
بورایەکەی : پاشوو . پاشی . پاشەل
کاو : کورایەکه بکەویتە جیگایەکی زور حاسی بە مەرجیٚ
هەر چوار لای شاخی بلندبیٚ
مر : شوان
هەرتك : هەردووك . هەردوو
ماخو ساحیب . خاوەن
زەم زەمه : هەیتوو هوت . دەستگاو سەلتەنەت .

زەوەزەوە : دەزیت
کودەلی : لەپشت
قوش : چویلەکە
برنجار : جیگەی برنج لی چاندن
سەکراو : سەکی ئاوی . یان ماینی خوش بەز
دیاردی : کاتی کە سـەـك نیچیر دەبینی . دیاردی بو
دەکەن چا هیرش دەبا
خیزەرەو بیزرە : پاش ماوە
ساموتە : کاتی کە نیچیر دەکوژن بە پاشکووە دەکری
تیسقەو قالیسقە : ئەو شتانەیە کە چاران دەرمانی تفەنگ
یان دەمانچە یان لەناو دەکرد
شاتر : خوش رو . خزمەت کوزارو بەوەفا
محەندەك : ئەسپی رەسەن



« ٢ »

# ئەو شوێن شارو دێیانەی کە لە بەیتو هەڵبەستەکانی عەلی ناو یان هاتوە

«» «» «»

بەردەشان (١) : دووگوند هەن لە ناوچەی مەرگە پێ یان دەڵێن بەردەشان عەلی خەڵکی ئەوی یە بیوکە ، لوتەر ، دولەبێ : چەند گوندێکن لە ناوچەی مەرگە « مەرگە ش ناحیەیە لە سەر قەزای قەلادزە »

زەڵتویران : دولێکی قووڵە لەو ناوچەیە دا .

تەواران : دیسان گوندێکە لەو ناوچەیە دا .

کوێخا ئە للا « عبد الله » بویژیکی میللی بە ناو بوە بەلام هەلبەستی لەپاش بەجێ نەماوە .

شیخ مصطفى : چاکێکە لەو ناوچەیە بە شیخ مصطفى ی قوتبی شامێ بەناو بانگە .

بیکم « بیکمە » : گوندێکە لە بەری مەرگە .

(١) بەردەشانی بچووکو گەورە ـ عەلی خەڵکی بەردەشانی گەورەیە .

شارەستێن : گوندێکە لە بەری مەرگە .

خانم کچی کاك ئەلیاس : شوخێکی زور بە ناو بانگ بوە لەو سەردەمە دا .

شاە عەباس : یەکی لە شایە زور دارەکانی فارسە « ٨٠ » هەزار کەسی لە خیلەکانی موکریان سەربری وە « ١٠ » هەزار کەسی لە ناو قەلای دمدم کوشت دەگەل قارەمانی مەزنی کورد « ئەمیر خانی یەك دەست۔ ئەمیر خانی لەپ زێرین » .

خوازیلە ۔ خازی ۔ خازیلە : کچێکی شوخ و شەنگ بوە هەندی دەلین یاری علی بوە و لە پاشان بوتە ژنی ، هەندیکیش دەلین تەنیا دوستی بوە ســەرچاوە بو کە لێ هەلبەست و بەیتی دلداری جوان عەلی .

بوتان و « جزیرو بوتان » : دوو ناوچەن زور فیراوان لە کوردستانی تورکیەی داگیر کراو .

ژەنگار : قەزای سنجارەو بە هەنجیر بەناو بانگە .

کاکە سوار : رەقیبی عەلی بوە « واتە حەزی لە خــازیلی کردوە » . وەکوو خوی دەلیت : هانی خەلکی دەدا کە عەلي شلو کوت بکەن .

مام خدر : دیارە بە ساوارکوتەرەوە بەناو بوە .

حەمە مەرگی : زور ناشـــیرین بوە بویە عەلی بە رەنگ قەلەبی ناوی بردوە .

ووسوو پلینگی : لەناوەکەی وا دیارە زور کورچ و کول بوە کەچی لە کاتێ لەعەلی داوە دوخینی پساوە .

خال خدر : دوستی عەلی بوە کەچی لەسەر ئەوەشـەوە مانی خەلکی داوە بو شلو کوت کردنی عەلی .

حەمە خیسە : دیارە ئەخق چاو خیس بوە .

مام قادر : گویا پیاوی باش بوە کەچی لە هەموان خراپ تر عالی داپەلوستوە .

مەولود کاوان : کەرچی درانگ شق بیسـتوتەوە بەلام ئەویش پەلاماری عەلی داوە .

مام باپیر : لەوانی تر بە بەزەیی تر بوە ووتویە لە عەلی مەدەن دلداری وای لی کردوە .

**تی بینی :**

ئەو ناوانەی لە سەرەوە باسمان کردن هەر یەکە رەوشتیکی بوە کە ئیمروش ئەو چەشنە پیاوانە ماون کە بەرەوشتیان ناویان دەبریت ، بەلام هونەری عەلی لەوەیە کە وەزعی رەوانیو رەوشق ئەوپیاوانەی زانیوە وەکوو پسپوریکی « رەوان شوناس » بەداخەوە ئەوانە تەنیا لەناو هەلبەستەکە داناو براونو لەبارەی ژیانیانەوە شتی نا زانین .

« » « » « »

سینداجیان : گوندیکە لە ناوچەی مەرگەو پشدەر

عمد ـ حەمە ـ حەمەد : وەکوو ووتمان یان شاگردی عەلی بوە یان شایەر بوە « سەرنج بدە بەیتی پیازان » .

مام جەدریس : پیاو چاکیکە بەلام جیگەی نازانین :

مەرو : شاریکە لە شارەکانی ئەفغانستان ، لەوانە شە کە گوندیك بوو بی لەناوچەی مەرگە » .

ئەللا کەچەل : خانە خویی عەلی بوە « بروانە بەیتی پیازان »

مام سلیمان : وادیارە قورئانیکی تایبەتی بوە ، یان لەو کاتە دا کەم کەس بوە قورئانیان بووبی بویە مروڤی قورئان دار زور بەناو بانگ بوە .

وەستا احمدی چەخماخ چی : باشترین وەستا بوە لە کوردستان بو دورست کردنی تفەنگ ، سەیر ئەوەیە لەسەدەی هەژدەمین کارخانەی تفەنگو دەمانچەو توپ لە کوردستان دا هەبوە کەچی لە سەدەی بیستەمین دەرزیەك ناتوانی دورست بکا ! » کارخانەی درو لەباوە !

بی ریشك ـ گووچار ـ بی دیل ـ ئەسریل ـ بیرەکان : هەموویان ناوی گوندن لە ناوچەکانی مەرگە یان پشدەر

بالەك ـ بالەکیان : خیلیکە لە ئەزای رەواندز دادەنیشن یان ناوچەیەکە لەوێ .

کانی پەلکو : وا دیارە لە کانی خوی دا یان حاکمی بابانەکان یان میرێ لەمیرەکان لەوی جی نووشین بوە

. مەنگورو مامەش : دوو خیلی زور گەورەن ـ لە کوردستانی عیراق و ئیران دادە نیشن بەلام زور ناریکن زور جار شەریان لێ قەوماوە « شەری مەنگورو مامەشان فولکلورە »

کەناو : گوندیکە لە ناوچەی پشدەر .

دەربەند : هەر وەك کە لە ریزە شـاخی ئاسوس و زیی کویەی پێ دا دەروات گوندیکیش هەیە لەزارکی ئەو دە ربە ندە بە دیوی رانیە دا ـ سەنگەسەریش گوندیکە دوای دەربەند بەرەو پشدەر لەو بەری رووباری کارفینەوە یە . دوای دوروست کردنی بناوانی دوکان و پوونگانەوەی ئاوەکەی خەلکە کە جێیان هیشت وچوونە « دوانزە بانوان » کە لەوی سەنکە سەری تازە دوروست کراوە

« » « » « »

کەژێ ـ قولە شین : ناوی ئەو جنوکە یە کە شـایەر بوەو شەرە شیعری دەگەڵ عەلی کردوە « بەیتی جندوکان بخوینەوە »

بسکی و نسکی : ژنی قولە شین بوە ، نسکیش ژن خوشکی زور جوان بوە .

عەنبەر : یان ژنی عەلی یان خوشکی بوە .

پیر مەمەندی مەمەنداوی : چاکیکە زور بەناو بانگە لەناو ولکەی خیلی مەنگور .

خوشاو : چاکیکەو ناوی گوندیکە .

سەنگاو : گوندیکی بەناو بانگە لەگوندەکانی کفری .

بیتوین : ئەو دەشتە پان و بەرینو بە پیتەیە دەکەویتە بەینی

بیستانەو هەتا دەربەندی سەنگەسەر دریژ دەبیتەوە هیچ دەشتی وا بە پیتو پان لە کوردستان بەرچاو ناکەویت بەلام داخەکەم هەموو عەردو بەراوی هی ئاغاو زوردارەکانی کوردە . « کویلەیی جوری ژیانی خەلکەلەوێ »

ئاکو : خیلیکی زور زالە لەناوچەی قەزای رانیە دادە نیشن

بلباس : خیلیکە بەشیکیان لە کوردستانی عیراقو بەشی تریان لە کوردستانی ئیران دادەنیشنو پی شیان دەلین « پیران »

گەلالە : ناحیەیەکە لە سەر قەزای رەواندز لە ناوچەی بالە کیان .

« » « » « »

حەمەداغا ! میریکە لە میرەکانی دەوری ئاورەحمان پاشای بابان

شارەزوور : دەشتیکە زور بەپیت لە ناوچەی سلیمانی ، بەلام پیش میلاد زلترین شار بوە لەناوچەی کوردستان هیردوتی میژوو نووس باسی بەدوورو دریژی دەکات .

خرە جو . گوندیکە لە تەنشت سەنگە سەر .

قورەگو : گوندیکە لە مابەینی دەربەندی سەنگەسەرو رانیە ئیستی بەژیر ئاوی دوکان کەوتوە .

سوران : بەوناوچـانە دەلین کە کانی خوی دەولەتی میر نوشینەکانی سوران تیی دادەست داربوون ، ناوچەی هەولیر سوران بوە ، ناوچەی سلیمانی بەبابان ناوبراوە .

فەقێ یان : گوندیکە نزیك کویە بەگوریەو کالە بەناوبانگە

سنە : شاریکی زور خوش‌و ز لە لەکوردستانی ئیران

حەسەن خەلەکانی : خەلەکان گوندیکە لە سەر ریکەی سلیمانی‌و رانیە ـ وادیارە ئەو حەسەنە زور قارەمان بوە .

سەید سمایلی کویستانی : چاکیکە لە سنووری کوردستانی ئیران

دوانزە مامان ـ دوانزە ئیمام : ئەوانە ش هەر چاکن .

دەشتی پیرە ریالی : گوندیکە لە ناوچەی دزەیی

قوریچە : گوندیکە لەدەشتی بیتوین نزیك شاری رانیە .

« » « » « »

عەلی نەك تەنیا شـــایەر بوە بەلکە زور کەراوەو لە جوغرافیە ش شـــارە زابوە ـ ویژەی میللی بویە بەنرخە چونکە ئاوینەیە بوبـاری ئـابووری‌و رەوشت خـو ، میژوو ، وە هەمەرو شتیکی تر لەو سەر دەمانە دا کە ئیمە هیچ نووسراویکمان بە دەستەوە نیە کە جوری ژیانی باوك‌و باپیرانمان بزانین بەغەیری فولکلورو بەیت‌و ئەفسانەو چیروك نەبێ جگە لە کتیبەکانی تر کە باس کورد دەکەن .